نەوشیروان مستەفا

# کێشەی پارتی و یەکێتی

ئامادەکردنی:
لوقمان عەباس
١٩٩٥ هانکۆ - فینلاند

بیرەوەرییەکانم
لەپەراوێزی هەڵبژاردنی یەکەمدا

ئامادەکردنی ئەم کتێبە بریتی یە لە کۆکردنەوەو نوسینەوەی ژمارەیەک نوسراوو وتارو چاوپێکەوتنی تەلەفیزیۆنی و ڕۆژنامەنوسی کاک نەوشیروان مستەفا، کە سەڵبەندی ڕێکخستنەکانی دەرەوەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بلاوّیان کردوونەتەوە. باسەکان هەمەلایەنەن، بەلاّم قورسایی یەکەی ئەکەوێتە سەر شەڕی ناوخۆی کوردستان لەنێوان یەکێتی و پارتی ١٩٩٤ ١٩٩٥، کاک نەوشیروان مستەفا هۆیەکانی هەڵگیرسانی دواییترین شەڕ بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێنێتەوە بۆ بەندەکانی ڕێککەوتننامەی پاریس، لەبەر ئەوە ڕێککەوتننامەی پاریسیش وەکو پاشکۆیەک لە کۆتایی کتێبەکەدا دێت.

# کوردستانی نوێ

## بیری هەڵبژاردنی گشتی چۆن هاتە کایەوە؟

لە ڕۆژانی ڕاپەڕین دا کوردستان چووە قۆناغێکی تازەوە. هەموو کەس چاوەڕوانی ئەوە بوو دامودەزگای بەعس لە بەغدا ژێر و زەبەر بێ. ئەو کاتە کەس بەبیریا نەئەهات پاش ئەو سەرکەوتنە گەورانە تێکشکان و ئینجا کۆچی بەکۆمەڵی خەڵکی کوردستانی بەدوادا بێ.
لە کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی دا، کاک مەسعودیش تیا بەشدار بوو، بڕیار درا: هەردو مەجلیسی تەشریعی و تەنفیزیی دەستنێژی بەعس هەڵبوەشێنرێتەوە و، لە ماوەیەکی کورت دا هەڵبژاردنی گشتی بکرێ. ئەم بڕیارە لە ڕادیۆکانی ئەو کاتەی لایەنەکانی بەرەی کوردستانی بڵاو کرایەوە. چەند ڕۆژێکی کەمی پێ چوو هێزەکانی بەغدا بەلاماری کەرکوک و بادینانیان دا و داگیریان کردنەوە. دوای ئەوێش هەولێر ئینجا سلێمانی ی گرتەوە. بڕیارەکەی سەرکردایەتی سیاسی ی بەرەی کوردستانی لە ناو کارەساتەکانی کۆچی بەکۆمەڵدا لەبیر چووەوە. کورد کەوتبوە هەڵومەرجێکی زۆر نالەبارەوە، خەریک بوو ئەبوو بەگەلێکی ئاوارەی بێ نیشتیمان. لەم هەلومەرجە نالەبارەدا

سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی بڕیاری دا: گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم بکات. خولی یەکەم کە بەسەرۆکایەتی مام جەلال بوو کورت بوو. باسە گشتی یەکان کرابوون. خولی دووەم بەسەرۆکایەتی کاک مەسعود بوو منیشیان لەگەڵ بووم، چوار ڕۆژ زیاتری خایاند. لەم ماوەیەدا هەلومەرجی ئالەباری کورد لەسەر ئاستی دنیا بەتەواوی گۆڕا. بۆ یەکەمین جار لە مێژوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا ئەنجومەنی ئاسایش بڕیارێکی دەربارەی پاراستنی کورد دەرکرد کە بڕیاری ٦٨٨ بوو. هێزی ئەمریکی، فەرەنسی، بەریتانی، ئیتالی، ئیسپانی، هۆڵەندی... هاتنە ناو کوردستانەوە، دەستیان کرد بە گێڕانەوەی خەڵک و، دامەزراندنی «پەناگەی ئەمین».

گۆڕانێکی بنەڕەتی گەورە بەقازانجی کورد، بەسەر کێشەی کوردا هات. کورد ئیتر ئەر گەلە ئاوارە لاوازە نەبوو ناچار بێ بەهەموو شتێ ڕازی بێ. ئەوەی بەعس ئامادەبوو بۆ کوردی بسەلمێنێ، زۆر کەمتر بوو لەوەی داوای ئەکرد. مام جەلال چەند جارێ بە بروسکەو بە نامەو بە گفتوگۆی بێتەل داوای ئەکرد: کە بۆ ڕاوێژو گفتوگۆ وەفدەکەمان بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، چونکە هەلومەرجی ڕۆژی چوونمان بۆ بەغدا لەچاو مانەوەمانا لەبەغدا زۆر گۆڕابوو. بەڵام کاک مەسعود سوور بوو لەسەر ئەوەی تا گفتوگۆکە بەئیمزا کردنی ڕێککەوتننامەی بەرە - ڕژێم تەواو نەبێ خۆی و ئەندامانی وەفدەکە هەر لەبەغدا دەبن. ئەمە یەکەمین درزی کردە ناو ڕیزەکانی بەرەوە، بەتایبەتی نێوانی یەکێتی و پارتی. لەگەڵ درێژەکێشانی گفتوگۆدا درزەکە زلتر ئەبوو و بەئاشکرا جیاوازی دیار بوو لەباری سەرنجی هەردوو سەرکردەو هەردوو لادا



دەربارەی ڕەوتی گفتوگۆو، خواستەکانی کورد لەبەعس و، داواکانی بەعس لەکوردو، هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەیی جیهانی.

من لەو ماوەیەدا کوردستانم بەجێ هێشتبوو. لەدەرەوە چاودێری ڕووداوەکانم ئەکرد.

جیاوازی هەڵوێستی پارتی و یەکێتی لە کشانەوەی هێزەکانی بەعس خەریک بوو ببێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان ئەم دوو هێزەدا. گەمارۆدانی ئابووری کوردستان و، دروستبوونی بۆشایی دەسەڵات و بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش، ناکۆکی یەکانی قووڵتر کردن. چەند جارێ کاک مەسعود زۆری بۆ سەرکردایەتی بەرە هێنا ڕێککەوتننامەکە پەسەند بکا، کاتێ زانی سەرانی بەرەی کوردستانی ئامادەنین بچنە ژێر ئەو بارە گرانەوە پێشنیاری کرد کە: پەنا ببرێتەبەر «ئیستیفتا» بۆ ئەوەی بزانرێ ئاخۆ زۆرایەتی خەڵک پرۆژەی ڕێککەوتننامەکە پەسەند یا ڕەت ئەکاتەوە؟ ئەوساش، بەهەڵە، کاک مەسعودیان وا تێگەیاندبوو کە هەموو کورد پێکهاتن لەگەڵ بەعس، هەرچۆنێ بێ، پەسەند ئەکا. لایەنەکانی ناو بەرەی کوردستانی، بەتایبەتی یەکێتی، پێشنیاری «ئیستیفتا»یان قۆستەوە بۆ گۆڕینی بە «هەڵبژاردن». کاک مەسعود جارێک ووشەی هەڵبژاردنی لای ڕۆژنامەی «الحیاة»ی لەندەنی، لەدەم دەرچوو. ئیتر لایەنەکانی ناو بەرە لەسەریان کرد بەماڵ. لەهەموو حێ ئەوترا هەڵبژاردن پێشنیاری کاک مەسعودە بۆ ئەوەی لێی پەشیمان نەبێتەوە.

## گەڕانەوەی نابەدڵ

تا لە ئەنفالی ۱دا ماڵ و باوەگاکانمان داگیر کرا خێزانەکەم لەبەرگەڵو لەگەڵ خۆم ئەژیان. دایکی مناڵەکانم لە ئۆتۆمبیل وەرگەڕابوو، تەرکی قورسی من و هەموو مناڵەکانی پێ هەڵنەئەسوڕا. «چرا و چیا» کە دووانەبوون و هێشتا ساوا بوون لەسلێمانی لای خزمان جێیان کرایەوە. دوای ئەنفال کەئیتر لەناو کوردستانی عێراقدا شوێنێک نەمابوو ماڵ و بارەگای تیا دابمەزرێنین، «ئنما و دایکی»م ڕەوانەی بەریتانیا کرد.

جێرومەند خەبەریان لە دوانەکەی سلێمانی دا. بەهۆی ئەوانەوە زۆری کەسوکارم گیران. لەناو ئەوانەدا دایکم، خوشکم، زاوام، حەسوم و حەزورم و کچ و کوڕو حرمە نزیکەکانیان. تەمەنی دایکم لە حەفتا ساڵ زیاتر و، چرا و چیاش لە ۳ ساڵ کەمتر بوو. هەموویان لە «ئەمن»ی سلێمانی کرکردەوە و پاشان بردیانن بۆ «ئەمن»ی بەعدا. دوای ماوەیەک بەهەوڵی پیاوچاکێ ئازاد کران. لەو هەلەدا چیاش گەیشتە دەرەوە ئەویشم ڕەوانەی لای دایکی کرد، چرا لە سلێمانی بەجێ مابوو.

دوای ڕاپەڕین بەچەند مانگێ، وەکو پێشتر بە ئاگاداری هاوڕێکانم بڕیارم دابوو، ویستم ئیتر لەژیانی سیاسی و گشتی بکشێمەوە و خەریکی ژیانی تایبەتی خۆم بم. منیش وەکو هەموو کەسێکی کە خێزانەکەی خۆشم



خۆش ئەوێ. ئەوساکە نزیکەی ۲ ساڵ بوو ئاگام لێیان نەبوو. هەلی سەفەرم بۆ ڕەخسا. چرام وەرگرتەوە هەلاتم بۆ ئەورووپا.
ئەو ماوەیەی لەوێ بووم لەگەڵ خێزانەکەما ژیانێکی ئاسوودەم بەسەر ئەبرد. یەکێ لەو کتێبانەی بەدەستمەوە بوو تەواو کرد. . هاوڕێ و دۆست و ناسیاو چ لە کوردستان و چ لە دەرەوە تێنێکی زۆریان بۆ ئەهێنام بۆ گەڕانەوە. بەڕاستی خۆم نەک حەزم بەگەڕانەوە نەئەکرد، بەڵکو زۆریشم پێ ناخۆش بوو، چونکە ئەو بەرنامەیەی بۆ پاشماوەی ژیانی خۆم دانابوو، تێکچوو. ئەوساش وەکو ئێستا، بەتەمای هیچ پلە و پایەیەکی حیزبی یا حکومەتی نەبووم. بەهەرحاڵ بەستنی یەکەمین کۆنگرەی یەکێتی ی نیشتیمانی هاتە پێشەوە. هەوڵێکی زۆرم دا خۆمی لێ لابدەم، کەڵکی نەبوو، لەژێر گوشاری هاوڕێکانما بەنابەدڵی گەڕامەوە بۆ کوردستان.
سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی بڕیاری دابوو هەڵبژاردن بکرێ. هێشتا قانونەکانی بەتەواوی دانەنرابوون، وەکو سەرەتا بڕیاردرابوو ئەنجومەنێ هەڵبژێردراو لە ۱۰۰ ئەندام پێک بێ.
کۆنگرەی یەکێتی لەسلێمانی ئەکرایەوە. کاک مەسعود بارزانی بانگ کرابوو. بۆ ئامادەبوون لە کۆنگرەدا هاتە سلێمانی. لەگەڵ مام جەلال چوین بۆ پێشوازی لێ کردنی. لەگەڵی چوینە باوەگای لقی سلێمانی. دوای گەڕانەوەم بۆ کوردستان ئەوە جاری یەکەم بوو بیبینم. هەواڵی دەرەوەی لێ پرسیم، منیش بۆم باس کرد:
_ کورد لەدنیادا دۆستی زۆری پەیدا کردووە.
_ ئەو قسەیەی کە ئەڵێ دەوڵەتانی ڕۆژئاوا ڕێگا بەکورد نادەن لە

ئۆتۆنۆمی زیاتر وەریگرێ قسەیەکی کۆنە.

– دۆستەکانی دەرەوە، بەو مەرجەی پارێزگاری یەکێتی ئەرزی عێراق بکرێ، مانعیان نییە کورد لە ئۆتۆنۆمی زیاتر هەرچی پێ وەرنەگیرێ بەدەستی بهێنێ.

لەسەر هەڵبژاردن و جۆری بەشداربوونی پارتی و یەکێتی و حیزبەکانی تر ڕەئی منی پرسی، وتم: لەبەر ئەوەی کورد لەم قۆناغەدا پێویستی بە«ئیستقرار» هەیە، «ئیستقراری سیاسی، ئابووری، نەفسی» چاکتر وایە دوو حیزبە گەورەکە «مونافەسەی» یەکتر نەکەن و، پێکەوە ئەرک وئۆباڵی ئەم قۆناغە چارەنووسسازەی مێژووی کورد هەڵبگرن.

پرسی: ڕەئی خۆت چییە؟ لەناو قسەکانم وتم:

– هەموو دۆستەکانی دەرەوە هەڵبژاردنیان پێ باشە.

– یەکێتی و پارتی بە لیستێکی هاوبەش بەشداری هەڵبژاردن ببن.

– لە تێکڕای ١٠٠ نوێنەرەکە، با ٣٥ نوێنەریان یەکێتی و ٣٥ نوێنەریان پارتی دایان بنێن و ٣٠ نوێنەرەکەی تر ڕێککەوتن لە بەینی هەردوولا لە کەسانی شارەزای سەربەخۆ هەڵبژێردرێن. بۆ ئەوەی هەرکات ئەو دوو فراکسیۆنە ناکۆک بوون لە دەنگدان، بێ لایەنەکان هاوسەنگییەکە ڕاست بکەنەوە.

ئەو کاتە حوکمی بەرەی کوردستانی و مافی ڤیتۆی ئەندامەکانی، کوردستانی تووشی پاشاگەردانی کردبوو. بۆ قانیع کردنی کاک مەسعود زۆرم بەهانە هێنایەوە. کاک مەسروری کوڕی کاک مەسعود، کە ئێستا لە واشینتۆنە، بە خۆی و کامێرایەکی ڤیدیۆوە هەمیشە لەگەڵ باوکی دا



بوو، هەموو ئەم قسانەی لە«بارەگای سلێمانی» دەستم پێ کرد و لە ئوتێلی «ئەبو سەنا» تەواوم کرد بەکامێرای ڤیدیۆ گرتبوی. لەناو قسەکانم دا باسی ئەوەم کردبوو کە هەڵبژاردنی گشتی و ئەو لیستە هاوبەشە یەکێتی و پارتی لە «ئیبتیزازی» حیزبە بچووکەکان ڕزگار ئەکا. هەندێ قسەی تریشم کرد. کەچی بۆ هاندانی ئەو حیزبانە دژی من وێنەیەکی ئەم شریتە ڤیدیۆیەی بەسەرکردایەتی هەموو حیزبەکان دابوو. من ئەوسا بە دەگمەن ئەچووم بۆ کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی یەکێتی، بەشداری کۆبوونەوەکانی هەردوو مەکتەبی سیاسی نەئەبووم. بۆ کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی بەرەش نەئەچووم، هەواڵەکانم لە بەشداربووانی کۆبوونەوەکە ئەبیستەوە.

لە چەند کۆبوونەوەیەکی هاوبەشی هەردوو مەکتەبی سیاسی دا چەندین جار پێشنیاری «لیستی هاوبەش» دووبارە کرابووەوە. سەرانی پارتی لایان وابوو یەکێتی لە لاوازییەوە، لە ترسی دۆڕاندن ئەو پێشنیارە ئەکات. لەبەر ئەوە هەموو جارێ بە لەخۆباییبوونەوە ڕەتیان ئەکردەوە.

لە ڕاستی دا یەکێتی نەئەوسا و نەئێستاش، ترسی دۆڕاندنی هەڵبژاردنی گشتی نەبووە. چونکە یەکێتی باوەڕی بە دیموکراسی هەیە، لە حاڵەتی بردنەوە و دۆڕاندن دا حورمەتی ویستی گەل ئەگرێ، ترسی ئەوەی هەبوو ئەگەر پارتی بیدۆڕێنێ، حورمەتی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە نەگرێ و شەڕی ناوخۆ هەڵبگیرسێنێ. چونکە دنیایان وائێگەیاندبوو کە ئەوان لە هەڵبژاردنی داهاتوودا ٧٥٪ی کورسییەکانی پەرلەمان وەرئەگرن ئەنانەت کاک مەسعود خۆی ئەمەی بە ڕۆژنامە ناسراوەکانی

لەندەن ڕاگەیاندبوو.

کە هەڵبژاردن کرا پارتی لەسەدا چل و چواری کورسی یەکانی هێنا، دروست بەئەندازەی یەکێتی. ئەوەی تری حیزبەکانی تر هێنابوویان. کاک مەسعود هەڵنەبژێردرا بە ڕابەر. پارتی ویستی هەموو شتێک تێک بدا. بۆ هەڵبژاردنی داهاتوو چەندین جار گفتوگۆی دووقوڵی لەسەر کراوە. چەند جارێکیش بڕیاری کردنەوەی دراوە.. لە پاریس هەردوولا وا ڕێک کەوتبوون کە؛

- سەرژمێری گشتی بکرێ.

ئەو کاتە مانگی تەمموز بوو کە ئەو ڕێککەوتنە ئیمزا کرا، وا بڕیار درا کە لە مانگی تشرینی یەکەمدا سەرژمێرەکە تەواو ببێ. تا کۆتایی کانوونی دووەمیش لیستەی ناوی دەنگدەران ئامادە بکرێ، فەرەنسی یەکان بەڵێنی یارمەتی یان دا.

- ئەوسا هەڵبژاردن لە کاتی قانونی خۆیا بکرێتەوە.

- هەر لایەک بەتەنیا بەشداری هەڵبژاردن ببێ، ئەبێ هەردوولا ڕێزی بگرن.

- بەگوێرەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە هەردوولا حکومەتی ئیئتیلافی پێک بهێنن.

پارتی بۆ تێکدانی ئەمە لەلایەکەوە کارێکی جاسوسی کردو، هەر لەگەڵ گەڕانەوەی وەفدی هەردوولا لە تورکیاوە، تێکستی ڕێککەوتننامەکەی پاریس. کە بەگوێرەی ڕێککەوتنەکەو مەرجی فەرەنسی یەکان ئەبوو بەنهێنی بمێنێتەوە تا کاتی ئیمزا کردنی لەلایەن سەرکردەی هەردوولاوە لە پاریس، پارتی بەدزی یەکێتی و فەرەنساوە دای بەتورکیا. ئەویش بۆ



هەڵوەشاندنەوەی. هەم پرۆتێستی دا بەفەرەنسا بەبیانوی ئەوەی جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکە هاندانە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کورد، هەم حکومەتەکانی ئێران و سووریاشی لێ ئاگادار کردو هانی دان بۆ دژایەتی کردنی. لەهەمان کاتا کوردیشی ئاگادار کرد کە تورکیا ڕازی نیە هەڵبژاردن بکرێ. بەم جۆرە ڕێککەوتننامەکەی لە بێشکەدا خنکاند.

لەلایەکی ترەوە بەبیانوی ئاسایی کردنەوەی هەلومەرجی کوردستانەوە یەکێ کارەکانی «کابینەی دوهەم»ی خست و نەشی هێشت «کابینەی سێ هەم» دابمەزرێ. کوردستانی خستە هەلومەرجێکی زۆر نائاسایی یەوە.

ئەوسا و ئێستاش، پارتی لە دوو شت زۆر ئەترسێ: یەکێکیان، سەرژمێری گشتی یە. ئەوی تریان، دووبارە بوونەوەی هەڵبژاردنی گشتی یە. چونکە ئەگەر سەرژمێری ووردی دانیشتوانی کوردستان بکرێ و ژمارەی ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەبە دیاری بکرێ، ئەوسا پارتی ناتوانێ یاری بە ژمارەی دەنگدەران بکا لە هەڵبژاردنی داهاتوودا. کاک د. ڕۆژ نووری شاوەیس ئەندامی مەکتەبی سیاسی پ.د.ک و هاوتای سەرۆکی وەزیران، ساڵێک زیاترە سەرۆکی کۆمیتەی ئەنجامدانی سەرژمێری گشتی یە. لابەلە دژوارەکانی ئەنجامدانی سەرژمێرەکە پلانی بۆ دانرابوو. بۆ کەس لێی ناپرسێ بۆچی ئەیکردووە؟ ئاخۆ کەمتەرخەمی خۆی بووە یان فەرمانی حیزبەکەی؟ سەرەڕای ئەمەش، لە هەڵبژاردنی گشتی ڕابردوودا پارتی بۆ بردنەوەی کارتی گرینگی بەدەستەوە بوو، لەوانە هاوکاری و یارمەتی حکومەتی بەعس، گۆڕینی

مەرەکەب، ئەزویری دەنگدانی بادینان و هەندێ مروڤێلی تری هەڵبژاردن... ئەمجارە ئەوانەی بۆ ناچێتە سەر.

لە یەکێ لەو کۆبونەوە ئازادارانەی هەردو مەکتەبی سیاسی کە کاک نێچیر بارزانی تیا بەشدار بیو و بۆ گفتوگۆ لەسەر دوا ڕێککەوتنی ستراتیجی، وتبووی: ئەو جۆرە هەڵبژاردنە شەرعیەت ئەدا بە شەڕی داهاتوو، چونکە لایەک ئەیباتەوە لایەک ئەیدۆڕێنێ، هیچ لایەکیش ئەو بردنەوەیە ناسەلمێنێ، لایە براوەکە پەلاماری لایە دۆڕاوەکە ئەدا، بەم جۆرە شەڕی ناوخۆ شەرعیەت پەیدا ئەکا.

د. فوئاد مەعصوم، بێ پرسی مەکتەبی سیاسی پێشنیارە کۆنەکەی دووبارە کردبووەوە. ئەوانیش موافەقەتیان لەسەر کردبوو. ئەمە پێش سەفەری کاک مەسعود بوو بۆ ئێران. دوای هاتنەوەی لە ئێران ئەمەی هەڵوەشاندەوە. بڕیاردرا هەرلایە بەجیا بچێتە هەڵبژاردنەوە.

پارتی هیچ جارێک و هیچ کاتێک جیددی نەبووە لە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی دووهەمدا، بەڵکو هەمیشە باسی هەڵبژاردنی بۆ «ئیبتیزازی» یەکێتی بەکار هێناوە. ئەگینا کە بهاتایەتە سەر دانانی ڕێوشوێنی ڕاستەقینەی ئەنجامدانی هەڵبژاردن، هیچی بەدەستەوە نەبوایە بۆ ئەگەرە لێدانی «ناڕازی بوونی تورکیا»ی ئەکرد بەبیانوی نەکردنی.



## ڕەوتی هەڵبژاردن

سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی بڕیاری دابوو کە ئەنجومەنێکی نیشتیمانی بە هەڵبژاردنی گشتی دابنرێ، بۆ ئەمەش گەڕابووەوە بۆ بەرنامەی بەرە. لە هەمان کاتا بڕیاری دابوو کە ڕێبەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردیش هەڵبژێردرێ. بۆ ئەمەیان هیچ بەڵگەیەکی لە بەرنامەو لە ئەدەبی سیاسی بەرەو هیچ کام لە حیزبەکان دا نەبوو. بەرەی کوردستانی کە دامەزرا لەبەر ئەوەی نەتوانرا لەسەر جۆری سەرۆکایەتی پێک بێن. وا ڕێککەوتن سەرۆکایەتی بەکی دووانەی هاوبەشی هەبێ. ئەم دووانەیە لە سەرۆکایەتی دا بریبووە کۆسپێکی گەورەی ڕێگای جولاندنی کارەکانی بەرە. لە سەرویەری هەڵبژاردن دا لە یەکێ لە کۆبونەوەکاندا د. مەحمود عوسمان پێشنیاری کردبوو کە «شوان»ێک بۆ کورد هەڵبژێرن بۆ ئەوەی لە کێشەی سەرۆکایەتی هاوبەش ڕزگاربین. ئەم پێشنیارەی د. مەحمود سەرکردەی هەردوو حیزبی گەورە: مام جەلال و کاک مەسعودی هاویشتە ناو مەیدانی «ئەحەددا - تحدی» کردنی یەکتری یەوە. هەر یەکێکیان قبوڵی نەکردایە یەرە تاوانبار ئەکرا کە ترسی دۆڕاندنی هەیە لە هەڵبژاردندا.

هەڵبژاردنی ڕابەری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەل بە هەڵبژاردنی گشتی لە ڕابردووی گەلاندا نموونەی نەبووە. بەبیروبۆچوونی من ئەمەیان لەگەڵ ژیانی سەردەم و نەریتی شارستانی نەئەگونجا. ڕابەر کاتی خۆی ناوی ڕەسمی هیتلەر، موسولینی، و دواییتر قەزافی و سەدام بووە. ڕابەر بە هەڵبژاردن دروست نابێ، بەڵکو لە پرۆسەیەکی مێژوویی دا هەڵئەکەوێ. کوردی عێراق لەو قۆناغەدا پێویستی بە ڕابەر نەبوو. پێویستی بە «حاکم» یان «سەرۆک»ێکی قانونی خاوەن دەسەڵاتی دیاریکراو، بۆ ماوەیەکی دیاریکراوی سەرۆکایەتی بوو. من درەنگ بە مەسەلەی ڕابەرم زانی کە سەرکردایەتی بەرە بڕیاری لێ دابوو. بێ ئەوەی نوێنەرانی یەکێتی لەدژی بوەستن. هەر ئەو کاتە دژی ڕاوەستام، چونکە بەشتێکی نەک هەر کۆنەپەرستانە بەڵکو بەشتێکی فاشیستیانەم ئەزانی.

سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی بڕیاری پێکهێنانی کۆمیسیۆنێکی قانونیدا بۆ دانانی قانونی هەڵبژاردنی گشتی ئەنجومەنی نیشتیمانیی کوردستان و، ڕابەری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد. زۆری ئەندامەکانی ئەو کۆمیسیۆنەی دانرابوون لە پارتییەوە نزیکتر بوون تا یەکێتی.

هەردوو قانون دانرا. نوێنەرانی پارتی ئیسرارێکی بێئەندازەیان بەخەرج دابوو لە گفتوگۆکانی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانیدا بۆ پەسەند کردنی قانونی ڕابەر، ئەنجامەت بەگرینگتریان دائەنا لەهی ئەنجومەن. ئەوساش وەک ئێستا، سەرچاوە درۆزنەکانی هەواڵ و ئاگاداری یەکانی پارتی دەنگوباسی درۆیان دابوو بە سەرکردایەتی پارتی. وایان لە کاک



مەسعود گەیاندبوو: دەنگدارانی کوردستان بێمنەت ئەو بە ڕابەر هەڵئەبژێرن. ئەویش حیەبنی بەبەعس دابوو کە هەڵبژێردرا بە ڕابەر ڕێککەوتننامەی کۆزیت لەگەڵ بەعس ئیمزا بکات و، هەر لایەک ڕازی نەبوو بیفلیقێنێتەوە.

لەبەردەمی ڕەوتی هەڵبژاردندا چەند کۆسپێکی دژوار هەبوو:

- نەبوونی سەرژمێرییەکو ووردی دانیشتوانی کوردستانی عێراق بۆ زانینی ژمارەی ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەبوو، بەتایبەتی ئەوانەی بەهۆی پێشمەرگایەتییەوە، بن بەهۆی ئەوەی لەناوچەکانی دەرەوەی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمدا بوون، کە لەدوا سەرژمێریدا ناویان کوژێنرابووەوە. یان بەهۆی ئەوەی لەدوای ئاشبەتاڵەوە پەنایان بۆ ئێران و وڵاتانی تر بردبوو.
- نەبوونی هۆکانی گەیاندن و پەیوەندی.

هۆکانی گوێزانەوەی دەنگدەران لە شوێنەکانی ژیانیانەوە بۆ شوێنی سندوقی دەنگدان و، نەلەفۆن و بێتەل بۆ ئەوەی سندوقەکان ئاگایان لەیەکتری و ناوەندەکانیان بێ.

- نەبوونی دەزگای کۆمپیوتەر بۆ هەڵێنجانی ئەنجامەکانی دەنگدان لەماوەیەکی کورتا.

## گۆڕینی
## مەرەکەبی هەڵبژاردن

بەر لە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی گشتی بە ماوەیەک . کۆنگرەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەسترا، نوێنەرایەتی سکرتاریەتی سۆسیالیست ئینتەرناسیونال ئامادە بوون . دەستەی نوێنەرایەتی پێکهاتبوو لە جوامێرێکی سویدی و، خانمێکی فەرەنسی و ، خانمێکی ئیتالی . دوای بەشداربوونی نوێنەرایەتی یە لە کۆبونەوە گشتی یە کاندا چ بە خوێندنەوەی وتاری پیرۆزبایی و چ بە گوێ گرتن لە میوانەکانی تر ، ئیتر کارەکانی ئەوان گەیشتە تەواو بوون . داوای دانیشتنێکیان لەگەڵ مام جەلال کرد . مام جەلال منی لەگەڵ خۆی برد . پاش هەندێ گفتوگۆی سەرەتایی ، لە مام جەلالیان پرسی : ئێمە ئەتوانین چ یارمەتی یەکتان پێ بدەین ؟ پاش باس کردنی هەلومەرجی کوردستان ، باسی هەڵبژاردنی کرد . لەسەر هەڵبژاردنی خۆی ئەدواو ڕووی قسەی بەرەو من کردەوە ، منیش دژواری یە دنیایی و ئیقلیمی ، ناوخۆیی ، ئینجا تەکنیکیەکانی هەڵبژاردنی گشتی ئەنجومەن و ڕێبەرم بۆ ڕوون کردەوە . وا تێگەیشتن ؛ دژواری یە ناوخۆیی یەکان و دژواری یە تەکنیکیەکان زۆرتر بوون لە دژواری یە سیاسی یە ئیقلیمی و دنیایی یەکان .

هەردوو خانمی فەرەنسی و ئیتالی و جوامێرە سویدی یەکە بە پەرۆشێکی



زۆرەوە هەواڵەکانیان وەرگرت . جوامێرە سویدیی یەکە وتی : من لە چەند وڵاتێکی وەکو وڵاتی ئێوە کە سەرژمێری دانیشتوانی تیا نەکراوە چاودێری هەڵبژاردنم کردووە ، ئێستا نامەوێ هیچ بڵێم کە گەڕامەوە پرسی هەندێک شارەزا ئەکەم و ئاگادارتان ئەکەمەوە .

وەکو بەڵێنی دا ، پاش ماوەیەک وەڵامی لێ گێڕاینەوە کە : سەرژمێر نابێتە کۆسپی ڕێگای هەڵبژاردن چونکە مۆرێ بە حۆزێ لە مەرەکەب لە دەستی ئەوانە بدرێ کە دەنگ ئەدەن تا ٤٨ سەعات ناچێتەوە . ئەمەش دوو کەڵکی هەیە ، یەکەمیان هیچ کەسێ ناتوانێ لە جارێ زیاتر دەنگ بدات ، دووەمیان ئەگەر دەنگدان بە یەک ڕۆژ تەواو نەبوو، ئەتوانرێ ڕۆژی دووهەم تەواو بکرێ .

ئەم باسە لە سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی دا کرا . لەو کاتەدا کاک مەسعود بە تەمای سەفەری ئەورووپا بوو . مەسەلەکەی گرتە ئەستۆی خۆی کە لەو سەفەرەی ئەورووپادا سۆراخی ئەو مەرەکەبە بکات و ، ئەگەر هەبێ مشووری پەیداکردنی بخوات ، کاک مەسعود لە سەفەرەکەی دا لەگەڵ کاربەدەستانی ئەڵمانی باسی کردبوو . ئەڵمانەکان دووپاتیان کردبووەوە کە مەرەکەبی وا هەیە و ، بەڵێنیشیان دابوو کە مەرەکەب و کاغەزی بەشی هەڵبژاردن دابین بکەن .

ڕێ وشوێنی ئەنجامدانی هەڵبژاردن بۆ پێشەوە ئەچوو . لیژنەی باڵای سەرپەرشتی هەڵبژاردن لەلایەن حاکم ئەمیر حەویزی یەوە سەرۆکایەتی ئەکرا . نوێنەری پارتی لە لیژنەکەدا کاک کەریم سنجاری و نوێنەری یەکێتی کاک جەمال تایەر بوو کە ئەفسەری پۆلیس بوو . شارەزای فرۆفێڵی هەڵبژاردن نەبوو . پارتی بەووردی لە هەموو ئاوچەکانی

کوردستانی عێراقی کۆڵیبووەوە بۆ دیاری کردنی ناوچەکانی نفوزی خۆی و ناوچەکانی نفوزی یەکێتی. کەریم سنجاری توانیبوی وا بکات لە ناوچەکانی نفوزی پارتی دا سندوقی دەنگدان زۆر دابنرێ و لە ناوچەکانی نفوزی یەکێتی دا هی کەم، بۆ ئەوەی هەموو لایەنگرانی یەکێتی نەتوانن دەنگ بدەن. بەتایبەتی ماوەی دەنگدان لە بەیانییەوە بوو تا سەعات ١٢ی نیوەشەو. ئەم فێڵە بەسەر نوێنەری یەکێتی دا تێپەڕیبوو. کاتێ یەکێتی بەمەی زانی داوای کرد چەند سندوقێکی تر لە چەند جێگایەکی تر دابنرێ، بۆ ئەوەی ئەم داوابە سەر نەگرێ پارتیش داوای دانانی چەندین سندوقی زیادەی کرد. لە ئەنجامدا لیژنەی باڵا داواکانی هەردوولای ڕەتکردەوە بەبیانوی ئەوەی لە ڕوی تەکنیکیەوە پێیان هەڵناسوڕێ، چونکە بەو ژمارەیە حاکم نیە.

ڕۆژی هەڵبژاردنی گشتی نزیک ئەبووەوە، بانگەشەی هەڵبژاردن ماوەکەی تەواو بوو، ئەو شەوەی مەرەکەب و مۆر لە لیژنەی باڵای هەڵبژاردنەوە گەیەنرابووە حاکم شێخ لەتیف شێخ ئەها سەرۆکی لیژنەی هەڵبژاردن لە پارێزگای سلێمانی و حاکم ئیبراهیم عەلی سەرۆکی لیژنەی هەڵبژاردن لە پارێزگای کەرکوک بۆ ئەوەی دابەشی بکەن بەسەر ناوەندەکانی هەڵبژاردندا، بۆیان دەرکەوت کە ئەو مەرەکەبەی بۆیان هاتووە زۆر بە ئاسانی ئەسڕدرێتەوە. لەبەر ئەوە دابەشیان نەکردبوو، بەڵکو ڕێککەوتبوو کە پێکەوە سەردانی من بکەن ر د. ڕۆژیش بانگ بکرێ بۆ ئەوەی هەردوو لامان ئاگادار بکەن لەو کێشە گەورەیە.

دوای ماندوبوونێکی زۆر ئەو شەوە من زۆر درەنگ نوستبووم بەتەما بووم بەیانی تا درەنگ ئەرخان بکەم بۆ تەمەڵی. بەیانی زۆر زوو



لەحەو هەڵیان ساندم، ئاگاداریان کردم کە میوان هاتوون. چووم بۆ بەخێرهاتنیان ڕوانیم حاکم شێخ لەتیف و حاکم ئیبراهیمن. دوای چاک و چۆنی لێم پرسین: خێرە وا بەم بەیانی زووە تەشریفیان هێناوە. وتیان: کێشەیەکی گەورە ڕووی داوە با د. ڕۆژیش بێت ئەوسا باسی ئەکەین د. ڕۆژیش گەیشت. ئینجا باسی مەرەکەبەکەیان کردو نمونەشیان بۆ تاقیکردنەوە لەگەڵ خۆیان هێنابوو. بەڕاستی کێشەیەکی گەورە بوو چونکە هەڵبژاردنەکە ئەند بوو بەم مەرەکەبەوە. حاکم ئیبراهیم بۆ ئاگادارکردنی لیژنەی باڵا بەڕێ کەوت بەرەو شەقڵاوە. لەوێش بەخراپی مەرەکەبەکەیان زانیبوو، دوو ڕۆژ هەڵبژاردن دواخرا بۆ دۆزینەوەی چارەیەک.

مەرەکەب لە ئەڵمانیا کاک مەسعود بەتەنیا خۆی بێ ئاگاداری هیچ کەسێکی لایەنەکانی تر بەڕادانی دابوو. دوایی تریش ئەڵمانەکان مەرەکەبەکەیان هێنابوو دابوویانە دەست کاک فاضل میرانی. ئەویش لە دهۆک لای خۆی بێ ئاگاداری یەکێتی و هیچ لایەنێکی بەرە تا دوو ڕۆژ پێش هەڵبژاردن، گلی دابووەوە و ئینجا ناردوویان بۆ لیژنەی باڵا لە شەقڵاوە و ئەوانیش دابەشیان کردبوو.

ئەگەر لە ڕەوتی هەڵبژاردن دا باسی «تەزویر» بکرێ ئەبێ لە پێش دا باسی گۆڕین و تەزویری مەرەکەب بکرێ کە خەریک بوو ببێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی کورد. یا هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردنەکە. ئاشکراش بوو کێ و کام لایەن مەرەکەبی تەزویر کرد؟

## نیسبەتی گومرگو
## نیسبەتی دەنگ

لە پێش هەڵبژاردندا خەڵک پەژارەیەکی ڕەوایان هەبوو. ئەترسان هەڵبژاردن ببێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ. ئەیانپرسی چی دەستەبەری ئەوە ئەکات کە هەموو لاکان، بەتایبەتی یەکێتی و پارتی، ئەنجامەکانی هەڵبژاردن قبووڵ بکەن؟

سەرکردایەتی هەردوو حیزب دوای چەندین کۆبوونەوە پێکهاتن لەسەر ئەوەی:

– هەردوو لا پەبێ ئەنجامەکانی هەڵبژاردن حکومەتێکی ئیئتیلافی پێک بهێنن.

دواییتریش سەرانی بەرەی کوردستانی «پەیمانی شەرەف»یان بە ئیمزاکراوی بە گەلی کورددا کە: ئەنجامی هەڵبژاردن هەر چۆنێک بێ ڕێزی ویستی گەل بگرن و، لەسەر بردنەوەو دۆڕاندن کێشەو شەڕ دروست نەکەن.

سەیر ئەوە بوو سەرانی پارتی زۆر مەغرور بوون. یەکێتیان بە لاواز ئەزانی. یەکێتی هەر پێشبڕکێکی باشی بکردایە بە گومانێکی قوونەوە لێیان ئەکۆڵیەوە. هەرگیز ئەوەیان بۆ یەکێتی بە دڵسۆزی و پەرۆشی



قازانجی نەتەوەیی و، ئاسایشی نەتەوەیی کورد دانەئەنا، بەڵکو بە ترس و لاوازی یا لە باشترین حاڵەتدا بە تاکتیک و فێڵبازی حیساب ئەکرد.

بۆ بڕیاردانی ڕاست زانیاری پێویستە، لەسەر بنچینەی زانیاری و دەنگوباسی ناڕاستیش بڕیاری ناڕاست ئەدرێ.

یەکێ لە گیروگرفتەکانی یەکێتی لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی یا ووردتر لەگەڵ سەرۆکی پارتی ئەوەیە: بەشێکی زۆری ئەو زانیاری و دەنگوباسانەی لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکانیانەوە پێیان ئەگات ناڕاست و بێ بناغەن. بگرە زۆر جار هەڵبەستراو و دروست کراون. ئەمەش بۆتە هۆی سەرلێشێوان و سەر لێتێکچوونی سەرکردایەتی پارتی. ڕاست و ناڕاستی لێ تێکەڵاو ئەبێ، بەبێ هیچ مەلامەتێکی بەجێ بڕیاری چەوت ئەدا. بڕیارەکانیشی کار لە هەلومەرجی کوردستان ئەکا. کار لە پاشەڕۆژی گەلی کورد ئەکا. باجەکەشی ئەبێ خەڵک و یەکێتی و حیزبەکانی تر بیدەن. وەکو ئەڵێن ئەمجارەش لەشکرکێشی بۆ سەر شەقڵاوە لە ئەنجامی دەنگوباسێکی درۆدا بووە دەربارەی کۆکردنەوەی هێزێکی یەکێتی لە هیران. دوای هەڵگیرسانی شەڕ ئینجا بۆیان ساغ بووەتەوە دەنگوباسەکە درۆ بووە.

ئەم سەرچاوە نا ئەمینانە هەندێ واهیمەیان لەلای بنەماڵی بارزانی و سەرکردایەتی پارتی دروست کردووە، کە گوایە! یەکێتی نیشتیمانی لەبنەڕەتدا بۆ دوژمنایەتی و لەناوبردنی ئەوان دامەزرێنراوە، چەندێ هەوڵ دراوە ئەم واهیمە بێ بناغەیەیان لەلا بڕەوێنرێتەوە، کەڵکی نەبوو.

سەرگروشتەی «قیادەی سلێمانی»و «قیادەی هەولێر»و «میزانی ململانێی مەرکەزە جیاجیاکانی قەرار»ی ناو یەکێتی لەو زانیاریە ناراستو هەڵبەستراوانەن کە بوونە هۆی سەرلێشێوانی سەرکردایەتی پارتی و، بڕیارە چەوتەکانی.

ئەم سەرچاوە نا ئەمینانەی ئاگاداری درۆ ئەدەن بەسەرۆک و سەرکردایەتی پارتی. قەوارەو هێزو توانای جەماوەریی پارتی زۆر زیاتر لەوەی بەڕاستی هەیە پیشان ئەدەن. هەر ئەم سەرچاوە درۆزنانە بوون لە کاتی هەڵبژاردن دا، لەکاتی گرژیو پێکدادانەکانی چەمچەماڵ و ئاکرێ و، لە فیتنەکەی مایسی ٩٤و، لە فیتنەکەی ئەم ڕۆژانەدا... پارتییان تووشی دەردی «زوور _ هەڵسەنگاندن»ی هێزەکانی خۆی و «ژێر _ هەڵسەنگاندن»ی هێزەکانی بەرامبەری کرد و، ئەو بەڵایانەی بەسەر خۆی و، میللەتەکە هێنا، کە خەریکە هەموو شت لەدەست کورد بدا.

هەڵبژاردن دەستی پێکرد، هەر بەیانی دەرکەوت مەرەکەبی دووەمیش ئەچێتەوە. گوێ بەوە نەدرا هەڵبژاردن درێژەی پێدرا. ڕیزی ڕاوەستاوەکان ڕەنگی حیزبەکەیان بەئاشکرا پێوە دیار بوو. د. مەحموود بروسکەی لێدا بۆ لیژنەی باڵا داوای ڕاگرتن و هەڵوەشاندنەوەی کردبوو. پ.د.ک.و حشع و حسک و پاسوک و گەل لەسلێمانی بەیانێکیان دەرکرد، ئەوانیش داوای هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردنیان کردبوو. کاک مەسعودیش کەوتبوە هەڕەشەی ئیعتیراف نەکردن بە ئەنجامەکانی هەڵبژاردن. بەهەر حاڵ هەڵبژاردن درێژەی پێدرا تا کاتی دیاری کراو، کە سەعات



١٢ی شەو بوو. لە ناوچەکانی نفوزی یەکێتی دا کە لەسەرەتاوە سندوقیان کەم بۆ دانرابوو دەیان هەزار کەس فریای دەنگدان نەکەوتن، لەوانە چەند پاڵێوراوێکی لیستی سەوز وەکو مامۆستا یان کەمال جەلال غەریب و حسێن عارف، لیژنەی باڵا هەڵبژاردنی درێژ نەکردەوە.

لایەنەکانی ئەندامی بەرەی کوردستانی لەوەپێش خۆیان لەناو سەرکردایەتی بەرەدا بەیەکسان ئەزانی. ئەوسا داهاتەکانی گومرک ئەدەچووە خەزێنەی حکومەتەوە، بەڵکو بەسەر ئەندامانی بەرەدا دابەش ئەکرا. هەر لایەک بەهۆی ئەو دەرامەتە نامە شروعەوە هەزاران چەکداری بەکرێ گیراو و لایەنگری هەڵپەرستی لەخۆی کۆکردبووەوەو، مووچەو ئیمتیازی پێ ئەدان. ئەئەما بوون لەهەڵبژاردن دا نیسبەتی دەنگەکانیان لە نیسبەتی گومرکەکەیان زۆرتر بێ.

نیسبەتی بەشی حیزبەکان لەگومرک دا و نیسبەتی دەنگەکانیان لەهەڵبژاردن دا بەم جۆرە بوو!

| | لەگومرکدا | لەهەڵبژاردندا |
|---|---|---|
| پارتی | ٣٠ | ٤٤،٥١ |
| یەکێتی | ٣٠ | ٤٤،٠٢ |
| زەحمەتکێشان | ٠٤ | |
| ئیسلامی | | ٥،١٠ |
| سۆشیالیست | ١٢ | ٢،٥٨ |
| پاسوک | ٠٤ | |

| | | |
|---|---|---|
| شیوعی | ١٠ | ٢,١٩ |
| گەل | ٠٨ | ١,٠٢ |
| ئاشوری | ٠١ | |

نیسبەتی دەنگەکانی هەردوو لا کە کاک مەسعود و هوشیار زێباری و قسەکەرەکانی تری پارتی لەهەموو جێگایەک ئەیشێوێنن کە گوایە لەسەدا پەنجاویەکیان هێناوە بەم جۆرە بوو ؛

| | |
|---|---|
| پارتی | ٤٢٨٣٩ |
| یەکێتی | ٤٢٣٦٨ |

لەبەرئەوەی هیچ کام لەلیستەکانی تر لەسەدا حەوت دەنگەکانیان نەهێنابوو دەنگەکانی ئەوانیش بەسەر هەردوو لیستی زەرد و سەوزدا دابەش کرایەوە .

ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لەگەڵ چاوەڕوانی هیچ کام لایەنە بەشدارەکان نەئەگونجا. هەموو لاکان بەتەمای دەنگی زۆرتر بوون لەوەی هێنابوویان .

— پ.د.ک لەزووەوە بەهەموو دنیای ڕاگەیانبوو کەخۆی بەتەنیا لەسەدا حەفتاوپێنجی دەنگەکان دەهێنێ، بەم پێیە ئەبوو کاک مەسعودیش بەمسوگەری بەڕاسەر هەڵبژێردرایە .

— ی.ن.ک یش چاوەڕوانی ئەوە بوو بە لایەنی کەمەوە ٥٠٪ی دەنگەکان وەربگرێ.

— حشع و حسک و پاسوک و گەل و ئیسلامیش چاوەڕێ نەکراوانە وای کرد هەموو لایەنەکان، جگە لە یەکێتی، ئەر پەیمانی شەرەفەی دابوویان



بەگەلی کورد، دەربارەی ڕێزگرتنی ئەنجامی هەڵبژاردن هەرچۆنێ بێ فەرامۆش بکەن، یەکەمین تەجروبەی دیموکراتی کوردیان بەر حنێو و توانج و پلار دا. کاک مەسعود خۆی ئەشکاند بەئەنجامی هەڵبژاردن ڕازی نەبوو لەبەر مەسلەحەتی کورد قبوڵی کرد. لە هەموو دنیادا بلاویان کردەوە کە ئەوان لەسەدا پەنجاویەکیان هێناوە لەبەر خاتری کورد وازی لە کورسی یەک هێناوە و بەنیو ڕازی بوون !.

## بەشی دووەم

کۆبونەوەیەکی پڕ هەراوهوریا، لەڕۆژی هەڵبژاردندا دەیان چاودێری بێگانەو پەیامنێری دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەسەرانسەری دنیاوە هاتبوونە کوردستان. دەیان هەزار کەسیش لەشەقامو شوێنە گشتییەکاندا چاوەڕوان بوون.

هەڵبژاردن تەواو بووبو، هێشتا بەتەواوی دەنگەکان جیا نەکرابوونەوە، دەنگی ناڕەزایی لە هەموو لایەنەکانەوە بەرز بووەوە. کاک مەسعود هەڕەشەی دەکرد کە ئیعتیراف بەو هەڵبژاردنە ناکات، چونکە سەرەتای دەنگوباسەکانی جیاکردنەوەی دەنگەکانی سلێمانی و کەرکوک و هەولێری بەدڵ نەبوو.

من لەسلێمانی بووم. لەسلێمانی چەند کەسێ لای پەیامنێرانی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی دنیا قسەیان دژی ڕەوتی هەڵبژاردن کردبوو، لەناو ئەوانەدا د. مەحمود عوسمان و مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، من خۆم بەقسەی هەندێ کەس ناڕەحەت نەدەبووم، زۆر لەوانەی قسەیان کردبوو کەسانێک بوون ئەوەندەی ئیمتیازاتی تایبەتی خۆیان مەبەست بوو، پاشەڕۆژی کوردیان بەلاوە گرنگ نەبوو بەلام زۆرم پێ ناخۆش بوو ئەمان قسەی وەها بکەن چونکە هیچ قازانجێکی تایبەتی یا

حیزبایەتی پان نەبوو لەبەدناوکردنی یەکەمین تەجروبەی دیموکراتی کورد دا.

مام جەلال بە پەلە داوای لیٚکردم بچم بۆ هەولێر، لەگەڵ کاک شێرکۆ بێکەس ڕۆیشتین بۆ هەولێر. جەوی سیاسی سەرانسەری کوردستان گرژ و ئالۆز بوو، خەڵک لەلایەکەوە مەترسی ئەوەیان هەبوو لایەنەکانی بەشداربووی هەڵبژاردن ئەنجامەکانی قبووڵ نەکەن و شەڕ هەڵبگیرسێ. لەلایەکی ترەوە بەتەمای دامەزرانی پەرلەمان بوون بۆ ئەوەی کوردستانیان بۆ بکا بە بەهەشتی بەرین.

کۆبوونەوەی سیاسی سەرکردایەتی بەرە هەبوو، کاک مەسعود سوور بوو لەسەر هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردن. لەناو کۆبوونەوەکەدا مشتومڕی توند و تیژ لەنێوان نوێنەرانی (پ.د.ک) و (ی.ن.ک) دا، هەروەها نوێنەرانی (ح.س.ک) و (ح.ش.ع) و (پ.د.ک) لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکە زۆر تووڕە بوون، زۆریان قسەی توندی کرد، بەقازانجیان نەبوو دەسەلاتی حکومەتی قانون دروست ببێ، دەیانویست حوکمی بەرەی کوردستانی بمێنێ، چونکە بەدامەزراندنی حکومەت دەسەلاتی حومکڕانی شارەکان و داهاتی گومرکیان لەدەست دەدا.

ئەم کۆبوونەوەیە زۆر قەرەباڵغ بوو. نامەوێ ڕووداوەکانی ئەم کۆبوونەوەیە بەدرێژی بگێڕمەوە چونکە زۆر کەسی تیا بوو، هێشتا هەموویان ماون لەسەرکردایەتی حیزبەکاندا با ئەوان لە «یادداشت»ەکانی خۆیاندا بینووسن، ئەگەر تیایاندا حەبێت «یادداشت» بنووسێ. من بەلامەوە گرنگ نەبوو کێ لەهەڵبژاردن دەباتەوە، بەلامەوە یەک شت گرینگی ژیانی هەبوو، ئەویش ئەوە بوو لەکوردستانی عیراق دا بۆشایی دەسەلاتی



حکومەت پڕ بکرێتەوە؛ بۆشایی حکومەت بەهەموو لایەنەکانی، بەڕێوەبەرایەتی، ئاسایش، گوزەران، بۆ دنیای بسەلمێنێ کورد دەتوانێ خۆی بەڕێوە ببات.

مەترسی ڕاستەقینەی هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردن بوو، چونکە ئەگەر هەڵبژاردن هەڵبوەشێنرابەتەوە؛

- دوای ئەوەی هەر حیزبە قەوارەی ڕاستەقینەی خۆی بۆ دەرکەوتووە، کێ دەستەبەری ئەوە دەکات جارێکی تر هەڵبژاردن بکرێتەوە؟
- جارێکی تر چۆن ئەو هەموو چاودێر و پەیامنێرانە کۆ دەبەوە؟
- جارێکی تر چۆن ئەو هەموو خەڵکە بەپەرۆشەوە لە بەردەمی سندوقی دەنگداندا ڕیز دەبەستن؟
- حکومەتێکی کە بەهەڵبژاردن، تەنانەت ئەگەر تەزویریش کرابێ، دەسەلات بگرێتە دەست باشتر نیە لەبۆشایی دەسەلات و نەبوونی حکومەت؟، بەتایبەتی ئەوانەی ناویان لەلیستی حیزبەکاندا نووسرابوون زۆریان دڵسۆز و نیشتیمانپەروەر بوون.

گوشاری دۆستانی دەرەوە، دڵنیاکردنی کاک مەسعود لەوەی کە دەیان هەزار دەنگی زیادیان هاوێشتۆتە ناو سندووقەکانی یادینانەوە، کەمێ کاک مەسعودیان هێمن کردەوە.

لەو کۆبوونەوەیەدا پێشنیارکرا نیسبەتی لەسەدا حەوت کە یاسای هەڵبژاردن وەکو لایەنی کەم لایبرێ و، هەر لایەکی بەشداری هەڵبژاردن بەگوێرەی ئەو نیسبەتەی هێناویەتی بەشدار ببێ. حیزبەکانی تر بەمە ڕازی نەبوون. ئەگەر ڕازی بوونایە زیاتر لە ۱۰ کورسی پەرلەمان بەر ئەوان دەکەوت و، حاڵەتی نیوە بە نیوە نەدەبوو.

لەپەراوێزی کۆبونەوەی سەرکردایەتی بەرەدا، کۆبونەوەیەکی دووقۆڵی سەرکردایەتی یەکێتی و پارتی بەئامادەبوونی مام جەلال و کاک مەسعود کرا بۆ بەلاداخستنی کێشەی هەڵبژاردن. هەردوولا پێکهاتن لەسەر ئەوەی :

– ئەنجامی هەڵبژاردن قبوڵ بکرێ.

– دوای ٦ مانگی تر هەڵبژاردن دووبارە ببێتەوە.

– پێشنیاو بکرێ بۆ حیزبەکانی تر نیسبەتی لەسەدا حەوت لاببرێ بۆ ئەوەی ئەوانیش بەو نیسبەتەی دەنگیان هێناوە بەشداری بکەن.

– ئەگەر حیزبەکانی تر ئامادە نەبوون ئەو پێشنیاوە پەسند بکەن، ئەوا یەکێتی و پارتی پێکەوە پەرلەمان و حکومەت پێک بهێنن، نوێنەری حیزبەکانی تریش لە وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتی دا بەشداری بکەن.

– سەرۆکی پەرلەمان لە پارتی بێ و سەرۆکی حکومەت لە یەکێتی بێ.

ئەم ڕێککەوتنە حزایە بەردەم سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی، بەنابەدڵی یەکی زۆرەوە پەسەند کرا.

ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لە کۆڕێکی ڕۆژنامەوانی دا لە لایەن حاکم ئەمیر حەویزی و بەئامادەبوونی مام جەلال و کاک مەسعود بلاو کرایەوە. دەنگی حیزبەکانی تریش دابەش کرایەوە بەسەر هەردوولادا بەگوێرەی دەنگەکانی هێنابوویان.

گرژی سیاسی زۆر زیادی کردبوو، مەترسی تێک بەربوونی چەکدار لەناو شارەکان دا زیادی کردبوو. بۆ خاوکردنەوەی گرژی یەکە، ئەو پێکهاتنە بەبروسکە بلاو کرایەوە، منیش بەپەلە چوومەوە بۆ سلێمانی، لە پێشەوە



چووم بۆ تەلەفیزیۆن دەربارەی پێکهاتنی یەکێتی و پارتی بەیامێکم تۆماو کردو داوام لە هەردوولا کرد وەکو نیشانەی برایەتی ئالای سەوز و زەرد تێکەلاو بکەن. لەوێوە ڕاستەوخۆ چووم بۆ سەردانی باوەگاتی لقی ٤ی پارتی بۆ دڵنیاکردنیان لە نیازی پاکی یەکێتی. هەردوولا ئالاکانیان تێکەلاو کرد.

د. ڕۆژ کە ئەوسا سەرپەرشتی لقی سلێمانی ی دەکرد ئالاکانی پێ لێک جیاکردنەوە.

سەرانی بەرەی کوردستانی، لەسەرو هەموویانەوە کاک مەسعود، ئەو پەیمانی ئەرەفەیان بەجێ نەهێنا کە دەربارەی ڕێزلێگرتنی ویستی گەل و قبوڵ کردنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن دابوویان بەمیللەت. هەموو هەڵبژاردنەکەیان خستە ژێر پرسیار و گومانەوەو کەوتنە تانەلێدانی و سووکایەتی پێکردنی. هەر لەبەر ئەوەی دەنگیان کەمتر هێنابوو لەوەی چاوەڕوانی بوون.

کاک مەسعود بەیانێکی دەرکرد دەربارەی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن، بۆ ئەزموونەکە ئەوەندە خراپ بوو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بەعس بەفراوانی وەکو خۆی بلاویان کردەوە، جگە لەوەش وای بەدنیا ڕاگەیاند کە پارتی لەسەدا پەنجاویەکی کورسی یەکانی پەرلەمانی هێناوە، بەلام لە پێناوی مەسلەحەتی کوردا ئەضحیەی بە مەسلەحەتی حیزب داوە!.

پارتی دیموکراتی کوردستان

ژمارە / ٣٥

لقی چوار

بەروار ٢١/ ٥/ ١٩٩٢

نهێنی و تایبەتی

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

وا دەقی بروسکەی (م.س)ی بەڕێز بەشی ڕێکخستنتان بۆ ئەنێرین، تکایە زۆر پەلە بکەن لە جێبەجێکردنی بەپێی ناوەڕۆکی بروسکەکە. پێویستیشە هەر لیژنەناوچەیەک تەقیمێکی تەواوی نوێنەرەکانی پارتیمان کە لەصندوقەکان بوون لەسنوری چالاکیتانو ئاگادارمان بکەنەوە بەپەلە.

بەرەو پێشەوە.

وێنەیەک بۆ /

- م.س بەڕێز بەشی ڕێکخستن بۆ ئاگاداریتان تکایە.

بەشی ڕێکخستنی لق.مان بۆ ئاگاداریتانو متابەعەی پێویست تکایە.

فایلی گشتی.

دەقی بروسکەکە

بۆ / گشت لقەکان

لە / م.س بەشی ڕێکخستن

دەمێت استغلالی ئەم وەضعە بکەن کە ی.ن.ک ئەم هەموو تەزویرەی کردووە. قیمەتی هەڵبژاردنیان نەهێشتو نەیان هێشت گەلی کورد سوود لەم هەلە مێژووییە وەربگرێت. تا ئەتوانن لایەنەکانی تر لەدەوری خۆتان کۆ بکەنەوەو



نەبێت هەم ناڕازی بوونی جەماهیر لەسەر ی.ن.ک توندتر بکەن کە نەیانهێشت هەڵبژاردن مەشروعیەت بروات. تکایە ئاگاداری ناوچەکان بکەن پێویستە زۆر بەفراوانی استغلالی ئەم موضوعە بکەن بەتایبەتی لەگەڵ حیزبەکان.

پارتی دیموکراتی کوردستان

ژمارە/ ١

لقی چوار

ڕۆژ ٢٢/ ٥/ ١٩٩٢

تایبەتی و نهێنی

بۆ/ گشت لیژنەناوچەکانی سنووری چالاکیمان

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

وا دەقی بروسکەی بەڕێز سەرۆکی پارتیمانتان بۆ ئەنێرین کە بۆ ئاگاداریتانو هۆشیارکردنەوەتانو زیاتر حوڵانتان، بەڵام بەهیچ شێوەیەک بڵاو ناکرێتەوە، تەنها بۆ ئاگاداری خطوطی تنظیمەکانمانو بەرەوپێش بردنی حزبەکەمانو استیعاب کردنی جەماوەری گەلەکەمان.

وێنەیەک بۆ/

م.س بەڕێز بەشی ڕێکخستن بۆ ئاگاداریتان تکایە.

بەشی ڕێکخستنی تێکۆشەری لق.مان بۆ ئاگاداریتان تکایەو متابعە..

فایلی تایبەتی و نهێنی.

(دەقی بروسکەکە)

بۆ/ هەموو لقەکان

لە/ م.ب

مەعلوم بوو کە پارتی ٥١٪ مقعەدی هێناوە وە ی.ن.ک ٤٩٪ بەڵام بۆ ئەوەی بەرژەوەندی گەلی کورد بپارێزین، پەرلەمان بەنیوەی بکەین و لەماوەی پێنج مانگی داهاتوودا هەڵبژاردنێکی تر بکەین تکایە هەمووتان لەئاستی مەسئولیەتی بەرزی بنەڕەتی خۆتان.

ملاحظە/ ئەمە بۆ بڵاوکردنەوە نیە تەنها خطوطی تنظیمی نەکەن.

(نهێنی و تایبەتی تەنها لەناوچەکان ئەمێننەوە)

بروسکەی هەڤاڵی خۆشەویست کاک مەسعود بارزانی

بۆ/ هەموو لق و ناوچەکان/ هەموو مقرات/ م.س

لە/ م.ب

١- ئەبێ پیرۆزبایی لەخۆمان بکەین کە گەلی کورد بەوپەڕی ئیلتزامەوە هەڵبژاردنە مێژووییەکەی ئەنجامدا بەبێ موشکیلە، وەئەبێ سوپاسی گەلی کورد بکەین.

٢- بەڵام بەداخەوە تەزویرێکی زۆر کراو صیحەت و شەرعیەتی هەڵبژاردنی نەهێشت وە ئەو لایەنەی ئەم تاوانەی لەسەر ئیسپات بێ ئەبێ ڕسوا بکرێت و گەل بیناسێ گەورەترین زەربەی لەئایندەی کورد و کوردستاندا.

٣- پاش ئەم تەزویرە ناکرێت ئەنجامی هەڵبژاردن قبووڵ بکرێت، هەوای



کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتی سیاسی بەرە دەکەین بەپەلە.

٤- نابێ ئەبێ حوزبێک تووشی نائومێدی و دوودڵی ببێت وە ئەم خەباتە و فەراغە ئەبێ هەوڵ بدەین سوود لەم هەڵانەی کراون وەربگرین بۆ ئایندە.

٥- لەگەڵ لایەنەکانی کە ئامادەن دژی تەزویر بوەستن نزیک ببن و تەنسیق هەبێ لەنێوانتاندا.

٦- هەموو ئیحتیاطات وەربگرن.

٧- چاوەڕوانی تەعلیماتی تازەبن.

٨- یەک بەیەک لەڕووداوەکان ئاگادارمان بکەنەوە.

پارتی دیموکراتی کوردستان

ژمارە/ ٢١٣٧

لقی چوار

بەروار ٢٩/٥/ ١٩٩٢

بۆ گشت لیژنەناوچە تێکۆشەرەکانی سنووری چالاکیمان

سلاوێکی شۆڕشگێڕانە

را لەگەڵ نوسراوەکەمدا تەعلیماتی (مەکتەبی سیاسی) بەڕێز بەشی ڕێکخستنتان بۆ ئەنێرین بەژمارە (٨٠٠) لەبەرواری ٢٣/٥/١٩٩٢. تکایە پەیڕەوەی ناوەڕۆکەکەی بکەن و بەشێوەی شەفەوی ئاگاداری ڕێکخراوەکانی سنوورتان بکەن یان بەنوسراوی تایبەتی ناوچەکان بۆ ئەوەی لەڕێگای ئەوانیشەوە گشت هەڤاڵو

باڵیوزانو لایەنگرو دۆستانی پارتیمان ئاگادار بکرێن.

ئیتر بۆ پێشەوە

وێنەیەک بۆ /

- بەشی ڕێکخستنی تێکۆشەری لقمان بۆ ئاگادارکردنتانو متابعە تکایە.

مابلی گشتی.

پارتی دیموکراتی کوردستان

ژمارە / ٩١٢

لیژنەی ناوچەی سلێمانی

ڕۆژ ٢٤/ ٥/ ١٩٩٢

(نهێنیو تایبەتی)

بۆ / گشت ڕێکخراوە تێکۆشەرەکانی سنووری ناوچەمان

سڵاوێکی شۆڕشگێرانە

وا دەقی بروسکەی (م.س) بەڕێز بەشی ڕێکخستنتان بۆ دەنێرین تکایە زۆر پەلە بکەن لە جێبەجێکردنی بەپێی ناوەڕۆکی بروسکەکە.

ئیتر بۆ پێشەوە..

وێنەیەک بۆ /

لقی چواری بەڕێز نیشانە مەعمورانمان ژمار (٢٠٣٥ ڕۆژی ١٩٩٢/٥/٢١) بۆ ئاگادارتان تکایە.



بەشی ڕێکخستنی تێکۆشەری لیژنەی ناوچەمان بۆ ئاگاداریو چاودێری ئەم بروسکەیە دەست بەجێبەجێکردنی ناوەڕۆکی بکەن.

(دەقی بروسکەکە)

بۆ / گشت لقەکان

لە / (م.س) بەشی ڕێکخستن

نابێت ئیستغلالی ئەم وەزعە بکەن کە ی.ن.ک ئەم هەموو تەزویرەی کردووە قیمەتی هەڵبژاردنیان نەهێشت وەمیان هێشت گەلی کورد سوود لەم هەلە مێژووییە وەربگرێت تا ئەتوانن لایەنەکانی تر لەدەوری خۆتان کۆبکەنەوەو نابێت ئەم نارازی بوونی جەماوەرە لەسەر ی.ن.ک توند بکرێت کە نەیانهێشت هەڵبژاردن بەشەرعیەت بڕوات. تکایە ئاگاداری ناوچەکان بکەن پێویستە زۆر بەفراوانی ئیستغلالی ئەم موضوعە بکەن بەتایبەتی لەگەڵ حزبەکان.

پارتی دیموکراتی کوردستان - عیراق

ژمارە/ ٨٠٠

مەکتەبی سیاسی

ڕۆژی ١٩٩٢/٥/٢١

بەشی ڕێکخستن

بۆ / گشت لقو ناوچەکانی تێکۆشەر

سەلاوێکی شۆڕشگێرانە

بۆ ئەوەی هەموو هەڤالان‌و پێشمەرگە ئەبەزەکانی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان‌و دۆستو لایەنگری پارتیمان‌و گشت جەماوەری کوردستانی خۆشەویست لەراستی ئەنجامی هەڵبژاردنی رۆژی ١٩٩٢/٥/١٩ بۆ ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان ئاگاداربن، بۆیە ئەم تەعمیمە بەفراوانی بڵاوەکەینەوەو بەسەر هەموو دڵسۆزانی پارتی‌و کاکە مەسعودبارزانی ئەمرۆ دڵنیایان بکەنەوە کە ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بەسەرکەوتنی پارتیمان‌و کاکە مەسعودبارزانی تەواو بووە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندی گشتی پارتی‌و شۆڕش‌و گەلی کوردستان وا بەبەسەند زانرا کە کورسی‌یەکانی پەرلەمان لەنێوان ئێمەو یەکێتی بەنیوەیی دابەش بکرێنت وەکو چۆن لەئیزگەو تەلەفیزیۆن بڵاوکرایەوەو بیستتان، ئەگینا هەڵبژاردنەکە بەشێوەی خوارەوەیە؛ کە پێچەوانە لەگەڵ نوسراوەکەی.

هەروەها چونکە حزبە بچوکەکان هیچیان نیسبەتی لەسەدا حەوتیان نەهێناوە بۆیە هیچیان نابنە ئەندامی ئەنجومەن، بەنیسبەت ئەنجومەنیشەوە چونکە پارتیمان دەنگی زیاتر بووە سەرۆکی ئەنجومەن پارتی دایدەنێت‌و جێگرەکەی سەر بە(ی.ن.ک) دەبێت، هەروەها ئیتیفاق کراوە کە رەئیسی مەجلیسی تەنفیری (ی.ن.ک) دایدەنێت جێگرەکەی لەپارتیمان بێت. ئەمانەتەکانیش هەروەها بەنیوە دابەش دەکرێنت لەنێوان هەردوو لایەندا. ئەم ئەنجومەنەش تەنیس دەبێت‌و لەماوەی چوار مانگدا هەڵبژاردنی ئەنجومەن سەرلەنوێ ئەکرێتەوە بەنیسبەتی رابەرەوە ، چونکە هیچ لایەنێک لەسەداپەنجای زیاتر نەهێناوە، هەرچەندە سەرۆکی پارتیمان لەسەدا چلوهەشتی پتر هیناوەو مام‌تالەبانی لەسەدا چلوپێنج. بۆیە لەماوەی دوو مانگدا ئەمجارە هەڵبژاردن تەنها لەنێوان هەردووکیاندا دەکرێتەوە

ئیتر بۆ پێشەوە...





ئەی جەماوەری خۆراگری شاری هەڵمەتو قوربانی..
ئەی ئەو قارەمانانەی کە بەخوێنی ئاڵی خۆتان راپەڕینی گەلەکەمانتان گەیاندە ئەو ئاکامەی کە جەماوەر تا ٨٨ حوکمڕانەکانی خۆیان بەخۆیان هەڵبژێرن، بۆ دابین کردنی ئاسۆیەکی دروناکترو گەشتر بۆ گەلە زۆرلێکراوەکەمان.
ئێوە بەناهەنگو بەوپەڕی دڵخۆشی‌یەوە بەرەو هەڵبژاردن چوون ئاوات‌و ئامانجی خۆتان بەماڵو منداڵو هەموو گەلەکەمانتان لەم هەڵبژاردنەدا بەدی دەکرد.
بەڵام وەکو ئاشکرایە لەلای هەمووان کە ئەم هەڵبژاردنە بەگشتی بەشێوەیەکی نازێک‌و ناپوختە لەبەر چەند دەستتێوەردانێک‌و چەند هەڵەیەکی تەکنیکی کە بوونە هۆی دروست کردنی ئاووهەوای تەزویرو لادان لەیاسای هەڵبژاردن چ بەهۆی خۆفەرز کردن بەسەر جەماوەردا چ بەهۆی فروفێڵی تابەجێبیانە.
جا ئەم کردەوە نادروستانە هەریمان ئاراستەی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی کردووە، بۆ ئەوەی ئەوان بەسیفەتێک کە ئاوەکو ئێستا دەسەڵاتی شەرعی لەکوردستاناو دانەری یاسای هەڵبژاردن بتوانن بڕیار بدەن لەسەر ئەنجام‌و چارەنوسی ئەم هەڵبژاردنە.
خوشک‌و برایانی بەڕێز..
هیواداریین ئارام‌بن‌و چاوەڕوانی بڕیارەکانی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی‌بن بۆ ئەوەی رەنجی سەدەساڵەو خەبات‌و تێکۆشانتان بەفیڕۆ نەچێت‌و رێگا بگرین لەهەموو دەستێکی تێکدەرو هەوڵێک کە دوژمنانی گەلەکەمان هەوڵ ئەدەن بۆ زیندەبەچاڵ کردنی ئاواتەکانتان‌و تێکدانی ئەنجامی هەڵبژاردن‌و شێواندنی شنەبای دیموکراسی کە رووی کردوتە

نیشتیمان‌و گەلەکەمان.

بەڕێزان ..

ئێمەی نوێنەرانی ئەم لایەنانەی خوارەوە بەگەرمی‌یەوە سوپاسی هەڵوێستی ئێوەی بەشەرەف‌و دڵسۆز دەکەین سەبارەت بە ئامادەبوونتان بۆ دەنگدان‌و دەستنیشان کردنی گەلێک لەو دەست تێوەردانانەی لەنارادان لەلایەن ئێوەی بەڕێزەوە، کە دەیسەلمێنن چەند بەپەرۆش‌و ئاماەزرووی ئەنجامێکی دروستی بێگەردو عادیلانەن.

ئێمەش بەو بیروباوەڕەوە گیانە بەرەیی‌یەی بۆمەرمان پێیەتی دەمانەوێت چارەسەری ئەم کێشەیە بەو شێوە دروستە بکەین کە دوژمنان‌و ناحەزانمان پێ نەخۆش بێت‌و شادمانی‌و مەبەستی ڕاستەقینەی هەڵبژاردنێکی ئازادو دیموکراسی‌یانە بهێننە دیو ڕیزەکانی بەرەی کوردستانی پێ پتەو کەین.

بژی بەرەی کوردستانی

بژی ڕای ڕاستەقینەی دروستی جەماوەر

حسک-پاسۆک، حزبی شیوعی، پارتی گەل، پ.د.ک

١٩٩٢/٥/٢٠

پارتی دیموکراتی کوردستان

ژمارە ٢٠٣٢

لقی چوار

بەروار ١٩٩٢/٥/٢١



بۆ/ گشت لیژنەکانی چاودێری تێکڕای سنورمان

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

وا دەقی هەردوو بروسکەی سەرۆکی پارتیمان بۆتان ئەنێرین.

تکایە بەپێی ناوەڕۆکی بسکەکان بەشێوەیەکی زۆر فراوان بچنە ناو جەماوەرو ڕاستی‌یان بۆ ڕوونکەنەوە.

ئیتر بۆ پێشەوە...

وێنەیەک بۆ/

بەشی ڕێکخستنی تێکڕای لقمان بۆ ئاگاداریتان تکایە.

بەشی عەسکەری تێکڕای لقمان بۆ ئاگاداریتان تکایە.

فایلی گشتی

(دەقی بروسکەی ١)

بۆ / لق ١ / فاضل / لق٢ / د.جرجیس / لق ٣ / د.جوهر / لق ٤ / د.ڕۆژ /

م.س

لە/ م.ب

ئەنجامی فەرزی دەنگەکان لەدهۆکو نەینەواوهەولێر، ئێمە زۆر باش سەرکەوتووین‌و تا ئێستا ئەنجامی کەرکوک‌و سلێمانی نازانین. گەورەترین غلط ئەوە بوو سرادەران سندوقەکان بۆ (ی.ن.ک) بەجێ نەهێڵن. یا جەماوەرمان هەمویان بزانن کە ئێمە لەسەتەوای کوردستان دەرئەچوین ئەگەر فەرزی دەنگەکان کرابا بەرەقمی هەموو ئەزویری کراوەو زۆر گرنگە هەموو خەڵک بزانن کە ی.ن.ک ویستویانە بەزۆر هەربجنو بەزۆر خۆیان فرض بکەن. لێرەدا

بەڕێزان ئەندامانی دەزگای ناوەندی ڕاگەیاندن. بەڕێزان کاربەدەستانی :
تەلەفیزیۆنی گەلی کوردستان. ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان.
ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. حەفتەنامەی الاتحاد :

پاش دەیان کۆبونەوەو دەیان سەعات گفتوگۆی پڕ لە مشتومڕی دووقۆڵی هەردوو مەکتەبی سیاسی ی.ن.ک و پ.د.ک لە هەولێرو مەلاحەددین و پاریس. گەلاڵەی ڕێککەوتننامەیەکی نوێ ئامادە کرا.
ڕۆژی ١١/٢٤ بەڕێز جەلال تاڵەبانی لەباتی ی.ن.ک و بەڕێز مەسعود بارزانی لەباتی پ.د.ک ڕێککەوتننامەیەکیان لەبەردەمی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتیمانی و، وەزیرەکانی کابینەی دووەم و، نوێنەرانی لایەنەکانی بەرەی کوردستانی و بزوتنەوەی ئیسلامی، کۆنگرەی نیشتمانی عیراق و، هەندێ لایەن و کەسی تردا ئیمزا کرد.
ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان ڕێککەوتنەکەیان پەسەند کرد. هەمو لایەنەکانی بەرەی کوردستانی و بزوتنەوەو، ئەنجومەنی نیشتیمانی عیراق پیرۆزباییان لێکرد، بەخۆشی یەوە چونکە ئومێدەوار بوون کۆتایی بەشەڕی ناوخۆ بهێنێ، بەگومانەوە چونکە ئەترسان چارەنوسی ئەمیش لەوانی تر بەختیار تر نەبێ.
بونەوەی ئەم ڕێککەوتنەش بەدەردی ئەوانی تر نەچێ. گەرەکمە لەبەراوێزی ئەم ڕێککەوتنەدا هەندێ بیرو بۆچون دەربڕم. ئەمە بەتەنیا



بیرو بۆچونی خۆم نیە، من تاقمێ لە سەرکردەو کادرو ئەندامی یەکێتی نیشتیمانی و کەسانی ناحیزبی یە کە پێکەوە لە «مینبەر»ێکدان. مینبەری دیفاع لە دەستکەوتەکانی گەلی کورد دژی هەڵبەر دەستدرێژی خۆپەرست و مشەخۆر و کۆنەخانین.
بەبیانوی ئەوەی کە پەیوەندی هەردوو ڕێکخراو : ی.ن.ک و پ.د.ک گرژی تێ نەکەوێ و، حەوی سیاسی کوردستان نەئاڵۆزێ ر، ئەشێوێ، زۆرجار سەرکردایەتی هەردوولا پێکهاتوون لەسەر ئەوەی بەئاشکرا و لەناو دەزگا گشتی یەکانی ڕاگەیاندندا باسی کەموکوڕی یەکانی یەکتری نەکەن، بەڵکو لە کۆبونەوەی دووقۆڵیدا ڕەخنە لە یەکتری بگرن.
ی.ن.ک زۆرتر پێڕەوی لەم سیاسەتە کردووە، بەلام پ.د.ک ئەوەندە گوێی نەداوەتێ. هەر کاتێ دەنگ کردن بەقازانجی بووبێ هاتوەتە دەنگ و، چی ویستبێ بۆ شکاندنی ی.ن.ک و سەرکردەکانی وتوویەتی، تەنانەت گەیاندویەتی یە موهاتەرات و جنێودان و بوختان هەڵبەستن. لە دەرەوەی کوردستانیش درێخی یان نەکردووە. لە هەر کۆڕ و کۆمەڵێکدا، لای هەر ڕۆژنامەوان و سیاسی و کاربەدەستێک هەڵیکیان بۆ هەڵکەوتبێت، چرنوکی خۆیان گرتووە.
سیاسەتی «دیزە بەدەرخونە کردنی ڕاستی یەکان» هۆیەکی سەرەکی هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ بوو. کەلەکەبوونی گلەیی و گازاندە لەیەکتری سەرەنجام بوو بەهۆی تەقینەوە. ئاشکراکردنی ڕاستی یەکان بۆ کۆمەلانی خەڵک، بەلام دوور لە مەبەستی فیتنە هەڵگیرساندن و، دوور لە موهاتەراتی شەخسی، یارمەتی خەڵک ئەدا، بیروڕای گشتی

دەربارەی کاری باش و کاری خراپ دروست بکات. بارمەتی حیزبەکانیش ئەدا بۆ ئەوەی بەکارەکانی خۆیان دا بچنەوە، ئەگەر چەوتی یەک قەوملێ راستی بکەنەوە.
شاردنەوەی راستی لە خەڵک زەرەر لە رەوتی جێبەجێ کردنی رێککەوتننامەکە و، چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایش ئەدات و، چاوپۆشین لە کاری چەوتی یەکتری، سەرلەنوێ زەمینەی شەڕ خۆش ئەکاتەوە.
هەر لەم روانگەیەوە تکام وایە لە هەموتان بوارم بدەن چەند راستی یەک روون بکەمەوە، ئەگەرچی لەگەڵ سیسەتی ی.ن.ک و دەزگای راگەیاندنیش نەگونجێ.
یەکێ لەو باشی یانەی لە سەرەتاوە لەناو یەکێتی دا هەبووە؛ ئەریتی دەربڕینی بیروبۆچوونی جیاواز و، لەیەک نەچوو بووە. لەسەرەتاوە ی.ن.ک کە دامەزرا لە ۳ رێکخستن پێک هاتبوو. هەر یەکێکیان رێکخستن و، سەرکردایەتی و، ئۆرگانی تایبەتی خۆی هەبوو، دەیانتوانی بەئازادی بیروبۆچوونی خۆیان بەقسە لە کۆبونەوەی فراوان داو، بەنووسین لە بلاوکراوەکانیاندا دەربڕن. پێگەیشتن و گەشەکردنی شێنەیی ژیانی ناوخۆی یەکێتی سەرەنجام ئەو ۳ رێکخستنەی کرد بە دووان و، دوایی تر بە یەک. ئەویش ئەم یەکێتی یەی ئێستایە. ئەوی من لەبیرم مابێ لە کۆنگرەی گشتی دا سەرلەنوێ داگیرابەوە لەسەر سەلماندنی ئەریتی ئازادی دەربڕینی بیرورا. تەنانەت هەبوونی مینبەری جیاواز. بۆیە داواتان لێ ئەکەم سەبارەت بەم مافە هەر ئەندامێکی ی.ن.ک هەیەتی و، سەرەرای ئەوەش کاتی خۆی رۆژنامەی کوردستانی نوێ



لەناو سەدان نوسەر و رۆژنامەنوسی گەنج و پیردا ئەم بەندەیان لەگەڵ چەند کەسێکی کەدا هەڵبژارد «کارتی رێزلێنان»یان بۆ نارد «نیشانەی بەدەوری دیاری .... لە بلاوکردنەوەی پەیقی رەسەنی کوردی» دا.
ئەم پێشەکی یەم بۆیە بۆ نوسین بۆ ئەوەی «مقەستی رەقیب» نەخەنە ملی نوسینەکان. دیارە ئەمجارەش وەک جاری تر ئەمتوانییوە ئەمانە بکەم بەرەنی رەسمی یەکێتی. وەکو هەندێ کەس ونویانە، بۆیە بەناوی خۆمەوە لەسەر مەسئولیاتی خۆم ئەنوسم. لێرەدا ئەمەوێ دوو نمونەتان لەسەر بیروڕای خۆم کە ئەمتوانی بیکەم بەرەنی رەسمی بۆ بنوسم:
- یەکەمیان سەردەمی حوکمرانی بەرەی کوردستانی، هەموو لە بیرتانە چ پاشاگەردانی یەک بوو. پێشنیارم کرد بۆ هاورێکانم، وەکو دەربڕینی نارەزایی لە باری گشتی ولات و، وەکو گوشارێک بۆ چاککردنی هەلومەرجی ناڕێکی ئەو کاتە، ی.ن.ک ئەندامێتی خۆی لە بەرەدا رابگرێ و، لەو لیژنانە بکشێنەوە کە حوکمی شارەکانی کوردستانیان بەدەست بوو، بۆ ئەوەی یەکێتی ئەبێ بەهاوبەشی بەرە لە هەڵگرتنی نۆبالی ئەو ناڕێکی بەدا. جێبەجێکردنی ئەم پێشنیارە زەرەری لە زۆر کادر و ئەندامی یەکێتی ئەدا، بێبەشی ئەکردن لەو ئیمتیازاتانەی ئەوسا هەیانبو. پێشنیارەکەم سەری نەگرت.. منیش بێدەنگ بووم.
- دووەمیان، دوای پێکهێنانی کابینەی یەکەم و، هی دووەمیش کە کارەکانی حکومەت و خەڵک رەنەوەستان بەهۆی «وەک یەکی وەزیر و وەکیل و، سەرەتای ئیوە بەئیوە» پێشنیارم کرد بۆ هاورێکانم، یەکێتی

لە حوکم بکشێتەوە، حوکم تەسلیمی پارتی بکات، یەکێتی بیێتە موعارەزەیەکی ئیجابی. جێبەجێکردنی ئەم پێشنیارەش زەرەری لە زۆر کادر و ئەندامی یەکێتی ئەدا، بێبەشی ئەکردن لەو ئیمتیازاتانەی هەیانبوو. پێشنیارەکەم سەری نەگرت.. منیش بێدەنگ بووم.
ئەجروبە سەلماندوویەتی و ساغی کردووەتەوە، بێدەنگ بوون هەمو جارێ باش نیە، بۆ ئەم جارە بەپێویستی ئەزانم، گەرماوگەرم، بڕێ لە بیروبۆچوونەکانی خۆم و هاوڕێکانم دەربڕم. لەمەش مەبەست خۆشکردنی ئاگری ئاکۆکیو شەڕ نیە، بەڵکو جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکە، کە من خۆم هەوڵێکی زۆرم داوە بۆ دەوڵەمەندکردنی ناوەڕۆکەکەی و داڕشتن و بەستن و ئیمزاکردنی.

لەگەڵ سوپاس و ڕێزی بێ ئەندازەی
ئەوشیروان مستەفا



## پارتی بۆچی هێزەکانی خۆی زۆرتر ئەکا؟

لەسەردەمێکا کە جەنگی عیراق و جەنگی کورد بەعس لەکابەدا بوو، کوردستان بووبوە سەربازگەیەکی گەورە. هەرکەسە بەجۆرێ چەکدار بوو. بەشێکی، بەناوی جیاجیاوە، لە ڕیزی هێزە چەکدارەکانی عیراق دا بوو، بەشێکیشی لە ڕیزی هێزە چەکدارەکانی حیزبە کوردییەکان بوون. لە ڕۆژانی ڕاپەڕین دا چەکدارەکان، ئەوانەی لەگەڵ بەعس بوون و ئەوانەی لەگەڵ حیزبە کوردییەکان بوون، هەموو تێکەڵاو بوون. سەدان بارەگای چەکدار بەناوی حیزبەکانەوە لە شەقام و کۆڵانی شار و نۆردوگاکان کرایەوە. هەبوون و هەڵگرتنی چەک، بەسووک و ناوەنجی و قورسەوە، بوو بەشتێکی ئاسایی. لەبەر ئەوەی لایەنەکانی ناو بەرەی کوردستانی خەریکی شتی تر بوون. ئەیان پەرژایە سەر ئەوەی ڕێوشوێنی لەبار و گونجاو دابنێن بۆ ڕێخستنەوەی چەکدارەکان و بەکارهێنانی چەکەکان بۆ پارێزگاری نیشتیمان لە هێرشی چاوەڕوان کراوی دوژمن.
لەدوای ڕاپەڕینەوە پێشمەرگایەتی مەعنا پیرۆزەکەی نیتر تەواو بوو، ئەوانەی چەکیان پێ بوو ئەبوو پێیان بڵێن چەکدار، چونکە ڕەوا ئەبوو ناوی پێشمەرگەیان لێ بنرێ. هەر حیزبە هەوڵی ئەدا بۆ

کۆکردنەوەی زۆرترین ژمارەی چەکدار بەناوی پێشمەرگەوە. لەو ململانێیەدا بۆ ڕاکێشانی خەڵک هیچ پێوانەیەکی شۆڕشگێڕانە یا نیشتیمانی یا ئەخلاقی لێک بەنەدرایەوە.
دیاردەی چەکداری لەبەرچاوی خەڵک ناشرین بوو. خەڵک تینیان بۆ هەموو لایەنەکان ئەهێنا، کە چارەسەرێکی ئەو دیاردە ناشیرینە بکەن. هەڵبژاردنی گشتی بوو، ئەنجومەنی نیشتیمانی و یەکەمین کابینە دامەزران.
سەرکردایەتی هەردوو حیزب پێکهاتن لەسەر پێکهێنانی وەزارەتی کاروباری پێشمەرگەو، یەکخستنی هێزی پێشمەرگەو، دیاریکردنی ڕێ‌وشوێنەکانی هەبوون و هەڵگرتنی چەک. ئەنجومەنی نیشتمانی قانونی بۆ هەموو ئەمانە دانا.
بەلام لەباتی ئەمانە جێگەی خۆیان بگرن، وەزارەتی پێشمەرگایەتی هەڵوەشایەوە، سوپای یەکگرتوی هەردوو حیزب لەیەکتری جیا بووەوە و کەوتنە شەڕەوە. قانونی هەبوون و هەڵگرتنی چەک کاری پێ نەکرا. بۆچی کەس ناپرسێ ئەمانە بۆ سەریان نەگرت؟ ئایا کورد پێویستی بەهێزی چەکدار نیە؟.
پارتی بەئاشکراو لەبەر چاوی خەڵک نەیتوانی دژی ئەم هەنگاوە شارستانی‌یانە ڕابوەستێ، بەلام هەوڵی ئەدا کۆسپ بهێنێتە ڕێگای جێبەجێ کردنیان. ئەگەرەی لێ ئەدان بۆ ئەوەی سەرکەوتوو نەبێ و سەر نەگرێ. چونکە پارتی ئەی ئەویست هێزی پارێزگاری نیشتیمان، کە دڵسۆز ئەبوو بۆ گەلی کورد و خاکی کوردستان نەک بۆ حیزب و



سەرکردە، دروست ببێ بەڵکو ئەیویست میلیشیاکەی خۆی بهێڵێتەوە و زیادتری بکا.
لێرەدا بەبیرهێنانەوەی ئەمە پێویستە چونکە ئەحروبەیەکی تازەی ڕێکخستنەوەی هێزە چەکدارەکانی کوردستان لەبەردەمدایە، بۆ ئەوەی پارتی نەتوانێ ئەوەش وەکو ئەوی پێشو لەبارببات هەروەکو سەرگرتن و سەرکەوتنی ئەوانی پێشو ئەبوون بەدەسکەوتی باش بۆ گەل. سەرگرتنی ئەمیش ئەبێتە دەستکەوتێکی گرنگی خەڵک.
بەگوێرەی ڕێککەوتنی پاریس ئەبێ ئەجنیدی ئیجباری بکرێ، بەم سەربازانەی کە لەم مەڵبەندانەوە کۆ ئەکرێنەوە سەرلەنوێ هێزەکانی لەشکر و پۆلیس و ئاسایش دروست بکرێتەوە بۆ پارێزگاری لە هەرێمی کوردستان و ئاسایشی سەروسامانی دانیشتوان. ئەم هێزانە ئەبێ دڵسۆزی نیشتیمان بن و، بەفەرمانی حکومەتی هەرێم بن نەک ئەم حیزب یان ئەو حیزب. شانبەشانی ئەمە ئەبێ ژمارەی پێشمەرگە کەم بکرێتەوە و، میلیشیای حیزبەکان هەڵبوەشێنرێتەوە، بۆ ئەوەی تووشی بێکاری نەبن گوزەرانیان دابین بکرێ.
لەدوا ڕێکەوتن‌دا دیسانەوە پێ داگیراوەتەوە لە جێبەجێ کردنی ڕێککەوتننامەکەی پاریس. هەروەها هەردوولا پێک هاتوون لەسەر ئەوەی ژمارەی چەکدارەکانیان تا کۆتایی ٩٤ کەم بکرێنەوە بۆ ١٥ هەزار.
ئەوەی جێگەی سەرنجە، پارتی ئەدوای هاتنەوەیان بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی کەوتوونەتە هەوڵی دروست کردنی دەبان فەوجی

کۆماندۆی نوێ. لە هەندێ شوێن لە نۆکەرە دڵسۆزەکانی ڕژێم. تەنانەت یەکێکیان بەشانازی یەوە وتبووی: هەرچی (تەزکیەی سوارەیی) ئەهێنێ وەرناگیرێ. لە دوای ئیمزاکردنی دوا ڕێککەوتن تازە بڕیاری دامەزراندنی (کولیەی جەنگی) داوە.

جا ئەگەر پارتی بەتەمای سەپاندنی شەڕ نیە بەسەرکردایەتی یەکێتی بۆچی تازەبەتازە دوای ئیمزاکردنی پەیمانی ستراتیجی تا ساڵی ۲۰۰۰ لەباتی ئەوەی هێزەکانی کەم بکاتەوە، هێزەکانی زۆرتر ئەکات و کولیەی جەنگ دائەمەزرێنێ؟ لەباتی ئەوەی بەهاوکاری لاکانی تر مشوری کردنەوەی مەڵبەندی تەجنیدی ئیجباری بخوێ، بۆ ئەوەی ناکۆکی هێزی دڵسۆزو بەرفەرمانی حکومەتی هەرێم دابمەزرێنێ، خەریکی کۆکردنەوەی هێزی بەکرێگیراوی دڵسۆزی حزبەتی؟.



## پارتی بۆچی «نیشتیمانی» سەیری ڕێکەوتننامەکان ئەکا؟

هەموو جارو، لە هەمو کۆبونەوە هاوبەشەکانی هەردوو مەکتەبی سیاسی دا هەرچەند باس لە ئاسایی کردنەوە ئەکرا، ئەوترا ئەسایی کردنەوە ئەبێ «کامل وشامل» و«لەهەموو ئاستەکان»دا بێ. ئاستی سیاسی، پێشمەرگەیی، بەڕێوەبەرایەتی. ئەبێ ئاسایی کردنەوە لەزاخۆوە هەتا کفری وەکو یەک بکرێ، نابێ هیچ جێگایەک لێی بپوردرێ ڕ، هیچ مەسەلەیەکی لێ دەربهێنرێ. نابێ هیچ لایەک ڕێگەی تر بدات «انتقائی» سەیری بەندەکانی ڕێککەوتننامەکان بکا، کەی بەقازانجی بوو جێبەجێی بکاو، چی پەدڵ نەبوو پشتگوێی بخا. ئەمانە سەرەتای گشتی بوون زۆرتر نوێنەرانی پارتی پێیان لەسەر دائەگرت و، ئەیان وتەوە. کەچی ئێستا خۆیان وا ڕەفتار ئەکەن. کامی بەقازانجێتی پێی لەسەر دائەگرێ و، هەرچی پەکیش بەقازانجی نی یە جێبەجێی ناکا.

هەر لەسەرەتاوە تەشەنەی ئاگری شەڕ لەسەر بادینان بوو. پارتی مەبەستی ئەبوو ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوک ئاسایی بکرێتەوە. یەکێتیش مەبەستی بوو بادینان ئاسایی بکرێتەوە. چونکە بادینان

لە مرۆدا گەروی کوردستانی عیراقە. بەڕێز حەلال تالەبانی و هاوڕێکانی، سەرانی کۆنگرەی نیشتیمانی عیراق، بە تەعبیری ڕوونکردنەوەی قسەکەری بەڕێزی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان - یەکگرتو لە سوریا کە «چەقی» بوون. لەبەر ئەوە نەبوو تورک ڕێگای پێ نەدان، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو هێزی چەکداری پارتی بادینانی داگیر کردبوو. ئازادی هاتوچۆ تەنیا بۆ ئەوانە هەبوو کە پارتی ڕێگای پێ ئەدان. بەڵێ لەسەر سنوری قۆڕی بادینان دا ڕاوەستابوون چاوەڕوانی بەجێهێنانی بەڵێنەکەی بەڕێز مەسعود بارزانی‌یان ئەکرد. گەشتێکی هاوبەشی ئەرسای بەڕێزان تالەبانی و بارزانی لەبادینانەوە تا گەرمیان هەر ئەو کاتە ئەیتوانی کۆتایی بە شەڕەکە بهێنێ. کە بەڕێز بارزانی ئەیتوانی بەڵێنەکەی جێبەجێ بکا، ئینجا بە هەلیکۆپتەری تورکی بەئاسمانی بادیسان‌دا گەڕانەوە.

بەڕیشی کێ ڕەوایە تالەبانی یەک هەموو تەمەنی لە ڕێگای بەدیهێنانی کوردستانێکی ئازادا بەخت کرد، سەرکردەی گەورەترین هێزی سیاسی و پێشمەرگەیی کوردستانی عیراق، نەتوانێ بەئازادی بەناو بادینانی ئازادا بگەڕێتەوە بۆ بارەگاکەی حزی لە هەولێر بۆ ئەوەی ئاوی کرژاندنەوەی یەکجاری بکا بەئاگری کڵپەسەندوی شەڕی ناوخۆدا؟ ئەوە بوو بەگەیشتنەوەی بڕیاری ڕاگرتنی یەکلایەنەی شەڕ دراو، بڕیاری کێشانەوەی یەکلایەنەی هێزەکانی یەکێتی دا. ئەوانەی پێیان وابوو یەکێتی خاوی ئەنوێنێ لە ئاسایی کردنەوەی هەلومەرجی سلێمانی دا ڕەنگە ئێستا بۆیان دەرکەوتبێ، کە یەکێتی لەسەر هەق بوو، کاتێ



داوای ئاسایی کردنەوەی سەرانسەری و گشتلایەنی ئەکرد، چونکە ئەو شارەزایی یەی یەکێتی پەیدای کردبوو لە پارتی، دڵنیابوو لەوەی پارتی ئنتقائی سەیری ڕێککەوتن و ئاسایی کردنەوە ئەکات. بایی ئەوەندە ڕێزی پەیمان و بەڵێن و گفتەکانی ئەگرێ کە سودی تایبەتی خۆی تیایە.
ئێستاش دوای ئاسایی کردنەوەی هەلومەرجی سلێمانی و کەرکوک، پارتی لەبادینان هێشتا هیچ هەنگاوێکی جیدی نەناوە بۆ چارەسەرکردنی کێشە سەرەکی یەکانی نێوان یەکێتی و پارتی.

## پارتی بۆچی داهاتی حکومەتی کوردستان بۆخۆی ئەبات؟

سەرچاوەکانی داهاتی حکومەتی هەرێم ئاشکرایە کامانەن. گرینگترینیان گومرکە، بەتایبەتی داهاتی گومرکی ئیبراهیم خەلیل لەزاخۆ. لەسەرەتای مانگی مایسەوە تا ئێستا، پارتی بەبیانوی هەڵگیرسانی شەڕەوە دەستی بەسەردا گرتووە، هەموو داهاتەکەی بۆ خۆی ئەبات. سەرەڕای ئەمەش، بەدرێژایی ئەو ماوەیە، هاویەش بووە لەخەرج کردنی ئەو پاشەکەوتەی حکومەتی هەرێم کردبووی و لەبانکی هەرێمدا دانرابوو.

ئەم کارە جگە لەوەی زەرەر لەبەرژەوەندی ئەتەوەیی کورد ئەدا چونکە حکومەتی هەرێم و خەڵکی کوردستان بێبەش ئەکا لەداهاتێکی گرینگی خۆی، پێچەوانەی ئەو ڕێککەوتنانەشە کە بەدووقوڵی ئیمزا کراون.

بەگوێرەی ڕێککەوتننامەکەی پاریس کەدوا ڕێکەوتن تەئکیدی لەسەر «ئیلتیزام»و «تەنفیز»ی کردووە. ئەبێ هەموو داهاتەکانی گومرک بچنە خەزینەی حکومەتی هەرێمەوە. سەرەڕای ئەمەش ئەبێ هەردوو حیزب حیساباتی خۆیان پێشکەش بەحکومەتی هەرێم بکەن کە لە ۱ی



مایسەوە تا ئێستا چەند پارەیان لەداهاتەکانی حکومەت بردووە. هەروەها ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستانیش لەبڕیاری ئاسایی کردنەوەی هەلومەرجی کوردستاندا داوای گێڕانەوەی داهاتەکانی حکومەتی کردووە. لەوانە گومرکی ئیبراهیم خەلیل.

خەڵک چاوەڕوانی ئەوەیە کابینەی سێیەم گوزەرانیان باش بکات. بەرنامەراسی حکومەت بەتەمان موچەکانیان زیاد بکرێ. خانەنشینەکان بەتەمان موچەیان بدرێتێ. کەسوکاری شەهیدان بەتەمان حکومەت موچەی مانگانەیان بۆ ببڕێتەوە. کرێکار و جوتیار بەتەمان حکومەتی هەرێم پرۆژەی ئاواکردنەوەی کوردستان دابنێ و هەلی کار بۆ خەڵک بڕەخسێنێ.

پارتی بەچ هەقێ بەشێکی گرینگی داهاتی ئەتەوەیی کورد بەبەرچاوی دنیاوە زەوت ئەکاو حەواڵەی بانکەکانی ئەورووپاو ئەمەریکای ئەکا، لەکاتێکا زۆرایەتی گەلەکەمان لەوپەڕی هەژاری و ئەداری دا ئەژین؟

ئەگەر منەتی ئەوە بەسەر کوردا ئەکات لەکاتی ڕاپەڕیندا ئیبراهیم خەلیلی لەدەسەڵاتی بەعس دەرهێناوە، خەڵکی بادینان لەبیریانە سەرکردایەتی کام لایەن نامەی بۆ هەموو «موستەشارەکان» نووسی و داوای هاوکاوی لێ کردن بۆ ڕاپەڕین. ڕادیۆی کام لایەن بوو «ئیعاز»ی دا بەشانە چەکدارەکانی بادینان بۆ ڕاپەڕین. مەسئول و هێزی کام لایەن بوو، بۆ دڵنیاکردنی خەڵک، لەپێش هێزە دوودڵەکانی ترا گەیشتە دهۆک و شارەکانی تری بادینان.

لەکاتی شەڕەکاندا یەکێکیان وتبوی: بەکێتی ئەو باوکەی مرد

جارێکی تر لەگومرگی ئیبراهیم خەلیل بەشی بدرێ. ئەم «قسەنەستەقە»یان دوایی لە وتارێکدا نوسی. وادیارە هێشتا جۆری بیرکردنەوەی سەردەمی شەڕی ناوخۆ زاڵە بەسەر مێشکی هەندێ لە سەرکردەکانی پارتی. ئەمەش پێچەوانەی گیانی ڕێککەوتنەکەی ئەم دواییەیە.

پارتی ئەیەوێ خەڵکی ناوچەی سۆران هەژارترین. ئەیەوێ یەکێتی نابووت بێ. بەو پارەیەی کەڵەکەی کردووە ئەیەوێ خەڵکی پێ بکڕێ و هێزی تازەی پێ دابمەزرێنێ. جا ئەو خەڵکەی ئەیکڕن ئەو هێزەی دای ئەمەزرێنن بۆ سەپاندنی شەڕێکی ترە بەسەر یەکێتی دا ؟ یان بۆ هەڵبژاردنی داهاتووە ؟ باشە ڕۆژ ئەمەیان ڕوون ئەکاتەوە.



## پارتی بۆچی ئەیەوێ
## ئاسایشی بخاتە ناوچەی سۆرانەوە؟

دانیشتوانی کوردستان بەخۆشحاڵی یەکی زۆرەوە هەواڵی ئاگربڕی شەڕی نێوان پارتی و بزوتنەوە - یەکێتی یان وەرگرت، ئومێدیان وابوو کە ئیتر جارێکی تر شەڕ ڕوونەداتەوە، ئاشتی و ئاسایش بکەوێتە وڵاتەوە. شەڕی بەئاشکرا ڕاوەستا. بەڵام لەدەروبەری ئیمزاکردنی ڕێککەوتنامەی دووقوڵی ی. ن. ک ـــ پ.د.ک زنجیرەیەک تاوانی ڕێکخراو دژی تێکۆشەرانی ی.ن.ک ئەنجام درا. ئەوە بوو لە ڕێگای چەمچەماڵ ٨کەس لەبەرپرسەکانی ی.ن.ک لە بۆسەیەکی ڕێکخراودا بریندار کران، بکوژەکانی ئەم ڕووداوە لەلایەن کاربەدەستانی پ.د.ک ەوە گوێزرانەوە بۆ هەڵەبجەو داڵدە دران. هێشتا خوێنی بریندارەکانی ڕووداوەکە وشک نەبوبوەوە لەناو شاری هەولێردا زنجیرەیەک تاوانی ڕێکخراوی تر دژی تێکۆشەرانی ی.ن.ک ئەنجام درا. ٢ پارێزەر و، پێشمەرگەو، زانایەکی ئایینی بوونە قوربانی. دوای ڕاوەستانی شەڕی ئاشکرای نێوان هەر ٣ لایەنی سیاسی، ئەبێ کێ لەپشتی ئەم شەڕە نهێنی یەوە بێ دژی ی.ن.ک ؟

خەڵک بەهیوا بوون دوای ئەو ڕێککەوتنە ئیتر ئەشەڕی ئاشکراو

ئەشەڕی نهێنی ئەمێنێ. بەهیوای ئەوە بوون ئاسایشی سەروسامانی هاووڵاتیان لەوانە تێکۆشەوانی حیزبەکان پارێزراوبێ. هەردوو حیزب ڕێککەوتوون لەسەر حەرام و تاوانبارکردنی کوشتنی تێکۆشەرانی یەکتری، تێکدانی کاری یەکتری و، دروستکردنی کێشەو گێچەڵ بۆ یەکتری. هەردوو حیزب پێکهاتوون دەزگای زانیاری ڕێکخستنی تایبەت تێکەڵاو بکەن.

بەر لەکردنەوەی بارەگاکانی پارتی لەسلێمانی، دانیشتوانی شاری سلێمانی شایەتن چۆن ئارامی و ئاسایش ڕاگیرابوو. تاوان کەم بوبووەوە. کوشتن، ماڵبڕین، فڕاندنی ئۆتۆمبێل، دیاردەی چەکداری لەڕادەی ئەبوودا بوون. بەلاّم ڕاستەوخۆ دوای کردنەوەی بارەگاکانی پارتی، تاوان دەستی پێ کردەوە. دزی و کوشتن و ئۆتۆمبێل فڕاندن و سەرانە سەندن بوەتە ڕووداوی ڕۆژانە.

لەهەولێر ئاسایش بەجۆرێ تێک چووە هیچ کەس لەسەروسامانی خۆی ئەمین نیە.

جێگەی داخە سەرچاوە نهێنی یە ئاگادارەکان وا ئەگەیەنن پارتی بەبەرنامە ئەیەوێ ئارامی و ئاسایشی شارەکانی ناوچەی سۆران، بەتایبەتی سلێمانی و دەوروبەری تێک بدات. خەڵک لەترس و پەژارەو نائەمینی دا بژین. ئەیەوێ هەلومەرجی سلێمانیش وەکو هەولێر لێ بکا. ئەیەوێ خەڵک وا تێبگەیەنێ کە ی. ن.ک ولاّتی پێ بەڕێوە ناچێ، ناتوانێ ئاسایشی سەروسامانیان دابین بکات و دنیاش وا حاڵی بکا کورد توانای بەڕێوەبردنی خۆی نیە. ئەگەر وا نیە بۆچی هاوکاری



پارێزگان هەولێرو دەزگا حکومەتی یەکان ناکەن هەلومەرجی ناوشاری هەولێر چاک بکەن، لەسلێمانیش هاوکاری ی پارێزگار ناکەن کارەکانی ئەنجام بدات؟ هەر ڕۆژە بیانوویەکی پێ ئەگرن و، هەردەمە هێرشێکی ناڕەوای ئەکەنە سەر. ئەگەر وا نیە ئەی بۆچی بەشدارانی تاوانی بۆسەی چەمچەماڵ لەباتی ئەوەی بگیرێن و بدرێن بەدادگا، لەژێر باڵی خۆیانا ئەحەوێننەوە؟

## پارتی بۆچی بووەتە چەتری پاراستنی پیاوخراپان؟

ساڵانی درێژی شەڕی بەعس - کورد ژمارەیەکی زۆر لە تێکۆشەرانی ڕێگای کوردایەتی کوژران و سەقەت بوون و زەرەرمەند بوون. لە بەرامبەر ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر لە تاوانبارانی نۆکەری بەعس دەسەڵاتدار بوون.

بێگومان لێبوردن لە ڕابردوو کارێکی باش و بەجێ و پێویستە. هەر ی.ن.ک یش بوو پێش ڕاپەڕین لە دەنگی زوڵاڵی ڕادیۆکەیەوە «ناشتبوونەوەی نیشتمانی» ڕاگەیاند. داوای لە هەموران کرد بە گیانی لێبوردن لەگەڵ یەکتری ڕەفتارکەن، و لە هەر سەنگەرێکا هەن هاوکاری یەک بکەن.

جێگای داخە پارتی بە جۆرێکی خراپ کەڵکی لەم مەسەلەیە وەرگرت. بەو کارانەی کە بۆ دەسکەوتی تەسکی حیزبایەتی و ڕاکێشانی ئەندام و لایەنگر لە ٤ ساڵی ڕابردوودا کردی خەریکە هەموو پێوانە نیشتمانیەکان هەڵئەگێڕێتەوە. خەریکە وا ئەکات!

- تێکۆشەرێکی خوێنەجتکەری ڕێگای شۆڕش و ئامێر مەعرەزەیەکی ظواری بچنە یەک ڕیزەوە.



- پێشمەرگەیەکی شەهیدر زیندانیەکی هەڵواسراو و جاسوسێکی گوژرار لە یەک لیستدا بنوسرێن.

پارتی بۆچی بێ گوێدانە هیچ پێوانەیەکی نیشتمانی داڵدەی هەموو جۆرەکەسێک ئەدا؟ بە هەق و بە ناهەق، لە سەریان ئەکاتەوەر هەڵئەداتی؟ لەناو لەشکرو ڕێکخستنەکانی دا پێشبان ئەخات؟ کاری گشتیان پێ ئەسپێرێ؟ لە دەرگار دائیرەکانی حکومەتدا پلەر پایەیان پێ ئەدا؟.

ئەم کارانە ڕەنگە لەگەڵ دەسکەوتی حیزبی بگونجێن، بەڵام بە هیچ جۆرێ لەگەڵ قازانجر دەسکەوتی نەتەوەیی ناگونجێ. پارتی بۆچی گوێ ناداتە قازانجی نەتەوەیی.

## پارتی بۆچی ئەیێلێ
## گوزەرانی خەڵک باش بکرێ؟

لەوەتی ڕژێمی بەعس و دەزگا جەهەنەمییەکانی ئەم وڵاتە باریان کردووە، هاووڵاتییانی کوردستان تووشی تەنگوچەڵەمەیەکی کوشندەی دووسەر بوون. سەرێکیان تەنگوچەڵەمەی گوزەران و، سەرەکەی تریان تەنگوچەڵەمەی سەلامەتی سەروسامان. جێگەی داخە ئەسەردەمی حوکمرانی بەرەی کوردستانی و، ئەسەردەمی حوکمی کابینەی یەکەم و، ئەسەردەمی حوکمی کابینەی دووەم نەیانتوانی ئەم تەنگوچەڵەمەیە چارەسەر بکەن یا هیچ نەبێ ڕێوشوێنی (نەزەریی) چارەسەرکردنی لەسەر (کاغەز) دابنێن.

هەتا کەی هاووڵاتی کوردستان لەترس و پەژارەی گوزەران و ئاسایشدا بێ، لەکاتێکا حزبی وا دانەنێ بەخەبات و ڕاپەڕینی ئەمان دەزگا جەهەنەمییەکانی بەعس لەکوردستان ڕاونراون. ئەوانەی ئێستا سەرکردایەتی ئەکەن بەپێڵاوی لاستیکەوە گەیشتنە کوردستان، کەچی ئێستا ئەمان لەبرسانا دەرگاو پەنجەرەی ماڵەکانیان ئەفرۆشن، ئەوانیش هەندێکیان لەشاهەنشا باشتر ئەژین و، کوڕەکانیشیان لەکوڕەکانی قەیسەرێکی قەڕنی ڕابردوو خۆشتر ڕائەبوێرن؟.



ئەم بێ عەدالەتییە لەبەر چی؟
بۆچی حیزبەکان بەدەستی خۆیان ئازاری میللەتەکەیان ئەدەن و؟ بۆچی بۆ دابینکردنی ژیانێکی هەژارانە، ژن و پیاوی میللەتەکەیان بەگەنج و پیرەوە، ناچار ئەکەن ڕێگای ناقانونی فێر ببن. لەکاتێکا سەروەت و سامانی کوردستانیش بەشی هەموویان ئەکات کە بەسەربەرزی و بەڕێگای قانونی بژین؟.

ی.ن.ک لەسەری ڕێکخستنەکەیەوە تا شانەکانی خواری خوارەوەی ئەم بێ عەدالەتییەی پێ خۆش نیە. ئەگەر پارەشی بەقەد پارتی لە حکومەت وەرگرتبێ، بەشی زۆری داوەتەوە بەخەڵک، بەناوی جۆراوجۆر و بەڕێگای جیاواز. یارمەتی ئاواکردنەوەی سەدان مزگەوت و گوندی داوە، یارمەتی نەخۆشخانەو زانکۆ و مەعهەد، یارمەتی مانگانەی سەدان خوێندکار و، هەزاران ماڵە شەهید و لێقەوماوی داوە. یەکێتی لەدەیان بواری خێر و چاکەدا بەپارە بەشداری کردووە.
ئەمەش مەیدانێکی گرینگی موناف‌سەیە: ئەوان پارەکەیان بۆ خۆیان ئەبەن و ئەیگوێزنەوە بانکەکانی ئەورووپا و ئەمریکا. یا ئەگەر شتێکیان لێ داوە بەخەڵک با ئاشکرای بکەن.
یەکێتی ئەیەوێ حکومەتی قانون و نیزام دروست بێ. دەرامەتی وڵات بچێتە خەزینەی حکومەتی هەرێمەوە، بکرێ بەپرۆژەی باشکردنی گوزەرانی خەڵک و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان. ئەنانەت ئەو پارانەی ئێستا یەکێتی ئەیاندا بەیارمەتی لەبواری جۆراوجۆردا، ئەویش هەر لەڕێگای حکومەتەوە بدرێ.

بەلاّم پارتی نەیەویّ حکومەتی میلیشیا بمێنیّ، دەسکەوتی دارایی بەئارەزوی خۆی، بیّ چاودێری، چۆنی بویّ، بەکاری بهێنیّ.
لەباتی ئەوەی یەکێتی و پارتی ئەو پارانە وەربگرن و، هەر لایەنە بەئارەزوی خۆی بەکاری بهێنیّ؛ لایەک بۆ استثماری تایبەتی، لایەک بۆ کاری دیعائی، با هەردوولا بۆ خزمەتی خەڵک بەکاری بهێنن.
با هەردولا ئەو کارانە بکەن بەلاّم لەرێگای دام و دەزگای حکومەتەوە. پارە وەرگرتن و پارە خەرج کردن لەرێگای دامودەزگاکانی حکومەتەوە بێ. بەلاّم رێگری گەورە لەم رێگەدا پارتی یە.
یەکێتی لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی دا حازرە واز لەهەموو ئیمتیازاتی خۆی بهێنێ.
بۆچی پارتی گویّ نادات بەرژەوەندی گشتی و ئامادە نیە واز لەهیچ ئیمتیازاتێکی خۆی بهێنێ؟



## پارتی بۆچی ناهێڵێ باندەکانی مافیا لەناو ببرێن؟

بەهۆی ئەو هەموو چەکدارەوە کە لە کوردستان دا هەبووە. دوایی بەهۆی بۆشایی دەسەلاّت و، ئینجا ململانیّی دەسەلاّت، چەندین باندی چەکدار لەکوردستان دا ئەراتێن ئەکەن. تاوان ئەکەن. یاسا ئەشکێنن. خەڵک ئەکوژن. دزی ئەکەن. ئوتومبێل ئەفرێنن، سەرانە لەخەڵکی بیّخاوەن ئەسێنن، مەکینەو دامودەزگا ئەکەن بەودیو سنوردا، دەستدرێژی ئەکەنە سەر بنکە سنورییەکانی گومرک، سامانی نەتەوەیی کورد تالاّن ئەکەن.
دانیشتوانی هەولێری پایتەختی حکومەتی هەرێمی کوردستان چەند ساڵە بەدەست ئەم باندانەوە ئەناڵێنن. بەبەرچاوی گەورە کاربەدەستانی حکومەتەوە، دەستدرێژی ئەکەنە سەر مافی هاوولاّتییان. کەچی کەس دەستیان لیّ نادا، کەس رێگایان لیّ ناگریّ.
پارتی لەپەنای ئاسایی کردنەوەدا ئەیویست سلەیمانیش، وەکو هەولێر بخاتە ژێر حوکمی باندەکانی مافیاوە.
با پارتی و یەکێتی پێکەوە دابنیشن، هەق و حیساب لەگەڵ یەکتری بکەن، ئەو باندانەی مافیا چەندیان سەر بەپارتین و چەندیان سەر

بەیەکێتبن.

یەکێتی ڕێکخراوێکە خەبات بۆ دامەزراندنی ژیانێکی شارستانی ئەکا، بۆ چەسپاندنی حکومەتی قانونی تێ ئەکۆشێ، هەوڵ ئەدا وڵاتێک دامەزرێ مافی هەموو کەسێکی تیا پارێزراوبێ، دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات وەکو یەک ڕێزدار و پارێزراوبن. یەکێتی دژی سەرەتای حوکمڕانی حیزب و حکومەتی میلیشیایە. لەبەر ئەوە یەکێتی دژی باندەکانی مافیایەو، داوای لەناوبردنیان ئەکا.

بۆچی پارتی ناهێڵێ دەسەڵاتی حکومەت و دامودەزگا قانونییەکانی بچەسپێ بۆ ئەوەی کورد لە حوکمی میلیشیا ڕزگار ببێ و، هەموو کەس بتوانێ بێ حیمایە و حەرەس بژی. ئەوسا باندەکانی مافیاش ناتوانن خۆیان لەژێر چەتری سیاسی هیچ حیزبێکا حەشار بدەن؟.

دەردەدڵ زۆرە، بەڵام جارێ ئەمەندە بەس بێ، تکاشم لە برایانی پارتی ئەوەیە، وەڵامی سیاسی ئەو هەموو «بۆچی یە سیاسیانە» بدەنەوە، پرسیارەکان و ئیتیهامەکان لەناو ئەپ ڕتۆزی موهاتەراتی شەخسی دا گوم نەکەن، ئەگینا بەپێی شەرعیەتی ئیسلام:

(السن بالسن، والعین بالعین، والبادئ اظلم) ئێمەش ڕەفتار ئەکەین.



# چاوپێکەوتنی تەلەفیزیۆنی

19.1.1995

**گرنگە دیاردەی چەکداری لەشارەکان نەهێڵرێت و شاری هەولێر تەسلیم بەحکومەت بکرێت و گەر پارێزکار دەوامیشی کرد دەبێ هاوکاری بکەن**

**بەداخەوە سەیرە کە سەرکردایەتی حزبێک خۆی بەپێشڕەوی میللەتێک دەزانێ بچێ نەخشەو پیلانی لەو بابەتە دابنێ کە ژیان نیفلیج بکا لەناو شارەکاندا!**

**ئەوان سیفەیی یەکەیان ئەوەدایە ئێمە لێرە لەسلێمانی بەسەلامەتی بەرێمان کردن بۆ هەڵەبجەو تاکو ئێستا سێ جار هێرشیان کردووەو ناوچەکەیان خستووەتە ناڕەحەتی یەوە**

لەبەرواری ۱۹۹۵/۱/۱۹ تەلەفیزیۆنی گەلی کوردستان کەناڵی هەولێر چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی لەگەڵ هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا ئەندامی مەکتەبی سیاسی ی. ن. ک ئەنجامداو لەو دیدارەدا بەرێزی جێگرای ڕێزو سڵاوی بۆ خەڵکی خۆڕاگری شاری هەولێر چەندین ڕاسپاردەو پێشنیاری پێشکەش کرد بۆ چۆنیەتی پاراستن و ڕێکخستنەوەی بارودۆخی ناو شاری هەولێر بەجۆرێک کە ژیانی هاوولاتییان و سەروەت و سامانیان پارێزراو بێ و دەزگا حکومی یەکان کارەکانی خۆیان ڕابەڕێنن. ئەمەش دەقی دیدارە تەلەفیزیۆنی یەکەیە:

• کاک نەوشیروان ئێمە لەهەموو چاوپێکەوتنەکانماندا لەگەڵ جەنابتان هەروەها ئەوە ڕونی دەڵێکیشە کە جەنابتان زۆر صریحن و بەشێوەیەکی واقیعیانە تەماشای شتەکان دەکەن، بەلام بەداخەوە هەندێ جار دەزگاکانی ڕاگەیاندنی پارتی ئەم هەلانە دەقۆزنەوە بەم لاو بەولای ئەبەن یان ئەیانەوێ چەواشەی مەسەلەکان بکەن، بۆ نمونە هەندێ لەو شتانەی کە بۆ جەنابتیان دروست کردبوو کە گوایە شاری هەولێر مقدساتی تیا نیە. حەز دەکەم ئەمە بێنمەوە یادی جەنابت وە ئەگەرچی من موقفی خەڵکی هەولێرت پێ ڕادەگەیەنم کە ئەم مەسەلەیە هیچ دەوری نەبینیوە، بەلام حەز دەکەم جەنابت لەو پروپاگەندانەی کە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی پارتی بۆ بەڕێزتان ئەکرە جێتان هەیە بۆ خەڵکی شاری هەولێر باس بکەن بەتایبەتی و کوردستان بەگشتی.

** بەڵێ حاڵی ئەمە لەبیشەوە قسەیەکی هەڵبەستراوی پارتی یە، من لەهیچ جێگایەک شتی وام نەوتووە، ئەگەر لەشوێنێکا شتێکی وام گوتووە یان نوسیوەمە من ئەحەدای پارتی دەکەم بیهێنێتە پێشەوە پیشانم بدات. شاری هەولێر دیارە یەکێکە لەشارە هەرە کۆنە ئاوەدانەکانی دونیا، بێجگە لەوە شارێکە کە رابردوویەکی رۆشنبیری دوورو درێژی هەیە، خەڵکی لەبابەت (ابن المستوفی) تیایدا بووە، یەکێکە لەو شارانەی کە ئێستا پایتەختی حکومەتی کوردستانە، جێگای پەرلەمانە، جێگای بارەگای مەکتەبی سیاسی ی.ن.ک، جێگای زۆری سەرکردایەتی حزبەکانە، ئەمانە هەمووی وای لێ دەکا کە هەولێر شوێنێکی تایبەتی هەبێ لەکوردستانی عیراقا نەک بەو شکلەی کە پارتی بەزمانی منەوە ئەو درۆیەی کردووە. شاری هەولێر شارێکی خۆشەویستە، شارێکی پیرۆزە، بێجگە لەمە چاکەو پیاوەتی شەحسیان بەسەر منەوە هەیە. لەساڵی ١٩٧٥ لەدوای ئاشبەتاڵ ئەو کاتەی کە حکومەت کەس وکاری پێشمەرگەیان ئەگرت من لە دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی بووم لە دوایی بە پێشمەرگایەتی گەرامەوە بۆ کوردستان، دایکم، خوشکەکانم، براکەم، هەموویان لە هەولێر بوون لە ١٩٧٥ تا ١٩٧٩، چونکە لە هەولێر بوون بەهۆی خەڵکی هەولێرەوە پارێزراو بوون و نە گیران، نە راونران و نە ئەزیەت دران، نە کەسێک زمانی لێدان، نەجاسوسی یان بەسەرەوە کردن. مانەوە لە ٧٩ کە خۆیان گوێزرابانەوە بۆ سلێمانی دووسێ مانگی پێ نەچوو کەوتنە ئازاردان و راونان و هەرەشە لێکردن. لەئاخرەکەی مەجبور بوون هاتنە لای من



لەئاوزەنگ. یەعنی بێجگە لەوەی کە شارێکە بەنیسبەت کوردەوە ئەهمیەتی هەیە بەنیسبەت خۆشمەوە. بەو ماوانەی دواییش دایکم لە هەولێر ژیاوە، ماڵەکەیان ئێستاش لە هەولێرە، لەبەر ئەوە من چۆن قسەی وا دەکەم، بەنیسبەت منیشەوە هەولێرو سلێمانی و دهۆک و فلان و فیسار هیچ فەرقێکی نیە، من خۆم هیچ تەحەییزێکی تایبەتیم بۆ سلێمانی نیە، من خۆم تەمەنم ٥٠ ساڵە لەو ٥٠ ساڵە تەنها ٢١ ساڵ لەسلێمانی بووم ٢٩ ساڵ لەدەرەوەی سلێمانی بووم، لەبەر ئەوە راستە کە من خەڵکی سلێمانیم و باوکیشم و باپیرم و باپیرەگەورەشم لە سلێمانی لەدایک بوونەو لە سلێمانی مردوون بەڵام وەکو کابرایەکی کورد قەت فەرق لەبەینی ئەوە ناکەم فلان شارو فیسار شارو یان ئەرجەحیەتی شارێک بەسەر شارێکی ترا بدەم، پێم وایە ئەمە لەمنەوە دوورە.

* کاک ئەوشیروان شاری هەولێر لەو شەڕەی دوایی داو ئەم رۆژانەی دوایی دوای ئەو شەڕە سەپێنراوەی بەسەر ی.ن.ک و لەوێشەوە بەسەر خەڵکی کوردستان و حکومەتی هەرێم سەپێنرا، شاری هەولێر بەرپەرچی ئەو زەبروزەنگەی هێزەکانی پارتی دایەوە. ئێستا شاری هەولێر بەدەست جەماوەری خەڵکی هەولێرەو هێزەکانی ی.ن.ک تیایدا باڵادەستی، هێدی هێدی شتەکان بەرەو ئاسایی بوونەوە دەچن. پەیامی ئێوە بۆ شاری هەولێر چی یە دوای ئەوەی کە خەڵکی قارەمانی

شاری هەولێر توانیان دەزگای درۆوەلەسەی گولآن و لقی دوو و ئەو دەزگایانەی کەوا وەکو بوون لەناوبەرن ؟

** وەڵلا من پێم خۆشە کە لێرە ئەوە ئاراستەی هاورێکانم بکەم لەشاری هەولێر کە ئێمە لە سلێمانی مەجموعەیەک شتمان مەنع کردووەو لەسەر مەنع کردنیش بەردەوامین، لەوانە خانوو داگیرکردن، خانوو تالآن کردن، سەپارە سەندن، چەک سەندن بەبێ موافەقەتی مەڵبەند، تۆڵەسەندنەوە، دەستدرێژی کردن بەهۆی بیروباوەری سیاسییەوە بۆ سەر ئەندامان و کادیرانی پارتی، ئەوانەی کە لەناو شارا ماونەتەوە. من پێم وایە ئەگەر هاورێکانی ئێمە لەهەولێر هەمان سیاسەت جێبەجێ بکەن، نەرم بن، مەجالی دزو درۆزن و ڕاووڕووتکەر نەدەن کە ماڵ تالآن بکەن و ماڵ داگیر بکەن، ئۆتۆمبیل بەزۆر لەخەڵک بسێنن، چەک لەخەڵک بسێنن، تۆڵە بکەنەوە. ڕێگا بە موەزەفەکانی پارتی بدەن کە کاری خۆیان بکەن و دەوامی ئیعتیادی خۆیان بکەن، ئەو کەسانەی کە پارتین و بەهۆی بیروباوەری سیاسییانەوە بەهیچ لایەکا نەڕۆیشتوون و لەماڵی خۆیان ماونەتەوە هەقی وایە ڕێزیان لێ بنێن و کەس دەستیان بۆ نەبات و ڕێزیان بگرن. بۆ ئەوەی بەئیحتیرامەوە شعور بکەن کە لەشارەکەی خۆیان ئەژین وە ممارەسەی کارو نەشاتی سیاسی خۆیان ئەکەن، لەهەمان کاتدا من تەئیدی حوکمرانی حزب ناکەم، پێم باش نیە. ئێمە هەر زوو لە سلێمانی کە بەو ئەزمەیە تێپەری دەست بەجێ پێشمەرگەمان لە سلێمانی بردە دەرەوە، کاروباری ناو سلێمانیمان تەسلیم بەحکومەت و موحافزو



ئاسایش و دایرەی پۆلیس کردەوەو پێشمەرگەمان دوورخستەوە لە حیمایەکردنی حادەو ڕێگاوبان و دانانی سەیتەرەو شتی لەو بابەتانە. من بۆ برادەرەکانی هەولێریشم، ئەوانیش هەق وایە هەر وا بکەن. ئەوە لە سلێمانیشەوە بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی ئەمرۆ لەگەڵ ٢٠٠ پۆلیسی هەڵبژاردەی باش ڕۆیشتوون بۆ ئەوەی کە هاوکاری بکەن لەگەڵ پۆلیسی هەولێرا، بۆ ئەوەی بەهەموویان بتوانن سەیتەرە بەسەر شارەکەدا بکەن وە ئەمن و ئاسایش و سامانی خەڵکی تەئمین بکەن و، حاران ئەگەر بەهانەی ئەوە هەبوو کە شارەکە چەکداری جیاجیا تیایە، فعلەن وابووە ئەنواعی باندی چەکدار لەناو شارەکەدا هەبوو، ئیستیغلالی ئەوەیان دەکردو لەژێر پەردەی سیاسی دزی و ڕاووڕووت و خەڵک کوشتن و ئۆتۆمبێل ڕفاندن،، ئەوانە هەبوو ... هەقی وایە لێرە بەدواوە یەکێتی لەوێ بەرپرسەری تواناو توندییەوە هەوڵ بدات کە مەنعی ئەو جۆرە شتانە بکات، هەتا ئەگەر کەسێک ئەندام یا پێشمەرگە یا چەکداری یەکێتی بوو کارێکی وای لێ وەشایەوە نابێ چاوپۆشی لێ بکەن بەهیچ جۆرێک، پێویستیشە سزای قورسی بدرێت. وەمن ئومێدم وایە کە ئەم تەجروبەیە لەشاری هەولێر سەرکەوتووبێت، قسەی ئەوانە بەدرۆ بخاتەوە کە پێیان وایە یەکێتی ئیدارەی ئەوێی پێ ناکرێت. من پێم وایە بە کەفائەتی برادەرەکانی خۆمان زۆرباش ئەتوانن ئیدارەی هەولێر بکەن کە هەموو کەسێک لەسەروسامانی خۆی تەئمین بێ، لەژیانی خۆی تەئمین بێ، بازار بەڕێکوپێکی هەبێ، جامعە بکرێتەوە، قوتابخانەکان و دائیرەکان دەوام بکەن.

ئومێدم وایە کە ژیان لەساوەیەکی کەما ئاسایی ببێتەوە، وە من حەز دەکەم لێرە ئەوە بڵێم ئەم جارە سەگەر بەزۆر هەولێرمان لێ بسێننەوە، ئەگینا ئێمە سیاسەتمان ئەوەیە کە هەموو شارە گەورەکان جارێکی کە چەکداری هیچ لایەنێکی تیا نەچێ. مانای نە سلێمانی و نە هەولێر و نە دهوک و شارەکانی لەبابەتی ئاکرێ و چۆمان و چەمچەماڵ و دەربەندیخان و شاری لەم بابەتانەش، ئێمە جارێکی کە ،، ئەوەی لەتوانای ئێمەدابێ قبوڵ ناکەین جارێکی کە چەکداری هیچ لایەکی تیا بچێ و ئێمە لە مستەقبەلیشدا وەعیان دەدەبنێ کە چەکدارەکانی خۆمان هەموو دوورخەینەوە، بەئومێدی ئەوەی کە لە فرسەتێکدا ئەم میلیشیایانە نەمێنێ و لەباتی ئەمانە جەیشی کوردستان دروست بێت و ئەحنبدی ئیجباری بکرێ و، شتی لەو بابەتانە بکرێت. جا یەکێ لەو شتانەی بەلامەوە گرنگە کە دیاردەی چەکداری لە شارەکان نەهێڵرێت و شارەکە تەسلیم بەحکومەت بکرێتەوە. هەتا ئەگەر پارێزگاری هەولێر کاک حورشید شێرە هات دەوامی کرد بابێ دەوامی خۆی بکات و، هەسان شت موەزەفەکانی تری پارتی کە لەدائیرەکانی ترا هەبوون ئەوانەی کە دەوام ئەکەن هەق وایە ڕێزیان لێ بگرن، دەوام بکەن، چونکە ئەوانە موەزەفی حکومەتن، پیاوی حکومەتن ،، پێویستە وەلایان بۆ حکومەت حەبێ نەک بۆ حزب. ئەوانەی کە داوا دەکەن قوتابخانەو خەستەخانەو دائیرە نەکرێتەوە... ئەوا ژیانی خەڵک دەخەنە ناخۆشی و ناڕەحەتی و، ئەوەش ئسلوبێکی زۆر زۆر خراپەو، ئەوە یەکێکە لەو شێوەکارانەی کە پارتی ئەیکات ،، شعور بە



مەسئولیەت ناکات. یان کارەبا بڕین یان تەلەفۆن بڕین یان کەمین دانان لەسەر جادەو تەقەکردن لەم و لەو،، ئەمانە ئاژاوە خستنە وڵاتەو ئیستفادەی نیە. من بەلامەوە سەیرە کە سەرکردایەتی حزبێک کە خۆی بە پێشڕەوی میللەتێک دەزانێ، بچێ نەخشەو پیلانی لەو بابەتانە دابنێ کە ژیان ئیفلیج بکا لەناو شارەکاناو خەستەخانەو مەکتەب و جامعەو دائیرە لە کار بخاو کارەباو تەلەفۆن ببڕێ. ئەمە کەی ئیشی حزبێکە لە دژی میللەتەکەی خۆی بیکات. لەبەر ئەوە ئومێدم وایە کە خەڵکی هەولێر هاوکاری لەگەڵ دام و دەزگاکانی حکومەت بکەن. تکاشم وایە لەهاوڕێکانم کە بەهیچ جۆرێک ڕێگا نەدەن دزو ڕاوڕووتکەر لەپەنای یەکێتی ئیشتمانیا چەک و ئوتومبێل لەخەڵک بستێنن و ماڵ تاڵان بکەن، ماڵ داگیربکەن، تۆڵە بکەنەوە،، نابێ بهێڵن ئەو شتانە بکرێ،، ئەگەر ئەوان ئیحراتات بکەن پێم وایە هێمنی و ئاسایش دەگەڕێتەوە بۆ شارەکەو پێشم وایە دەتوانن بیکەن.

● لەم شەڕەی دوایی دا، شەڕ لەناو شاری سلێمانی ڕوودی نەدا، معامەلەی هێزەکانی یەکێتی لەگەڵ لقی (٤) چۆن بوو ؟

●● ئێمە لەڕاستیدا لەپێشەوە پەیوەندیمان تەبیعی بوو،، ڕاستە ئەوان کە هاتنەوە، بەشکلێکی ئیستفزازی هاتنە ناو شارەوەو پێیان وابوو شارەکەیان ئیحتیلال کردووە. بەلام لەدواییدا پەیوەندی مەڵبەند و لق ئیعتیادی بوو، پاش ئەوەی کە بارەگاکانیان کرابەوەو دانیشتن و گفتوگۆ

حەبوو ، ، نائارامی یەکە لەسەرەو دەستی پێکردو لە سلێمانی نەبوو.
لەوەوە دەستی پێکرد کە پەلاماری شەقلاوە درا. کە هەرکی بەکانیان وا
لێکرد، کە ڕێگەی سەلاحەدین و ،، هێزێکی زۆریان کۆکردەوە قەندیل و
حەریریان داگیر کرد. لە سلێمانی لەوانە بوو هیچ ڕوونەدات، لە سلێمانی
ئەو برادەرانە کە ڕۆیشتن بەراستی پێمان ناخۆش بوو، حەزمان دەکرد
لق و ناوچەو کادوەکانی تریان بمێننەوە، بەجیمایەو حەرەسی خۆشیان.
بەلاٌم ئەوان فکرێکی تریان هەبوو، هەندێ هێزی ئیراقی یان هێنابووە
ناو شاری سلێمانی یەوە، لە هەمان کاتدا لە هەڵەبجەوە هجومیان کرد و
هاتن تاوەکو نزیکی کانی پانکەو گریزەیان داگیرکرد. بەتەمابوون ئەو
دوو خەتە لەیەکتری بدەنەوە، بەخەیاڵی خۆیان ویستیان سلێمانی داگیر
بکەن. بۆیان نەچوە سەر، کە هێرشەکەیان شکا(بالمناسبە ئەمشەویش
بەتەمان هێرشێکی تر بکەن)، یانی ئەوان سیاسەتیەکەیان لەوەدایە ،،
ئێمە لێرە بەشول و سەلامەتی بەرێمان کردن بۆ هەڵەبجە ،، لەو
وەختەوە تاکو ئێستا سێ کەرەت هێرشیان بۆ سەر ئێمە کردووە، یانی
سێ جار هاتونەتە سەرمان لەجیاتی ئەوەی چاکەمان بدەنەوە. سێ جار
پەلاماریان داوین و ناوچەکەیان خستوەتە نارەحەتی یەوە، ناوچەکەش
هەمووی کەس وکاری خۆیانن.
خەڵک لە ئەنجامی ئەو گومرکی ئیبراهیم خەلیل و شەڕی شەقڵاوەیە،
هەندێ کەس لەناو شارا ئەنگیان پێ هەڵچنیبوون.
ئەنگ پێهەڵچنینەکە لەراستیدا مەعلوماتی بەکێنی نەبووەو ئێمە
پێشمان خۆش نەبووە. بەلاٌم جاری وا هەیە عەفەویەتی خەمساوەر



هەندێ موشکیلەو شتی وا دروست دەکات. ئەو برادەرانە لە پێشا
مەقەرێکیان چۆل کرد، وتیان شەڕمان پێ دەفرۆشن و ئیستیفزازمان
دەکەن و مەقەرەکەیان کە چۆڵ کرد تەسلیمی حزبی شیوعی و ئەوان
کرا. لە دوایی هەموویان لە باکوری سلێمانی و گەرەکی ئازادی لە گەڵ
بارەگایەکی خۆیان بەو مەنتیقەیەدا تەوزیع بوون و ژمارەیەک کولانیان
داگیرکردبوو، دووریەتەیان دەکرد، لەو کاتەی ئەوان لە مەنتیقە بوون
نزیکەی (١١١) کەسیان بەدووریەتە کوشت لە هاوولاتی و پۆلیس و
پێشمەرگە ، ئەمەشی زۆریان منالٌ بوون ، کۆمەڵێ خەڵکی تریشیان
بریندار کرد، چونکە سەربان و کولانەکانیان گرتبوو، سەیتەرەیان تیا
دانا ، لەسەربانەوە تەقەیان دەکرد ئەگەر قەڵەبالغیەکیان بدیبایە. تا
ئاخیری بەکەی وای لێ هات کە ئێمە پێمان وتن یان بچنەوە
مقەرەکانی خۆیان یان بەو شێوەیە لێتان قبوڵ ناکەین، حزبەکانی
دیکەش کەوتنە بەینەوە بەتایبەتی بزوتنەوەی ئیسلامی، ئەوانە ئێمە
پێمان وتن کارگێرەکانی لق و ناوچەو حیمایەو حەرەسەکانیان لە
شوێنەکانی خۆیان بمێننەوەو ئێمە وەعد دەدەین لەبەرچاوی هەموتان
کە پەلاماریان نادەین و شەڕیان پێ نافرۆشین و ئیحتیرامیان دەگرین و
بەهاوکاری ئیشەکانمان جێبەجێ دەکەین. بەلاٌم ئەوان خۆیان ئەمریان
بۆ هاتبوو یاخود دڵنیا نەبوون لە ئێمە، بۆیە وتیان ئێمە لە سلێمانی
دەکشێینەوە، ئێمەش نوێنەری خۆمانمان لەگەڵیان ناردن و حزب و
لایەنەکانی تریش نوێنەرانی خۆیان لەگەڵیاندا ناردن بەدوو سێ قافلە
لە سلێمانی یەوە هەرچی یەکیان حەبوو نەقلمان کردن بۆ شاری هەڵەبجە.

لە سلێمانی لە ڕاستیدا شەڕ نەبووە تەنیا هەندێ وردەتەقە هەبوو، ئەویش هەندێک جار نەک عەمەلیاتی ئێمە نەبوو، بەڵکو دیسانەوە ئەو هێزی شەڕەخۆرەی کە هەمیشە حەز ئەکا شەڕ هەڵبگیرسێ بۆ ئەوەی لە شەڕەکەدا بچێ دزی بکا، تفەنگێکی دەستکەوێ. قەنەفەیەکی دەستکەوێ یاخود شتێکی دەستکەوێ بیبا لە بازاڕ بیفرۆشێ. ئەگینا هێزی ئێمە نەبوون، هێزی ئێمە نەچوونەتە سەریان و تەعلیماتیشمان بەکەس نەداوە بچێتە سەریان و لە سلێمانی شەڕ نەبووە. ئێوە خۆتان ئەتوانن پرسیار بکەن.

من ئومێدیشم وایە ڕۆژێ لەڕۆژان بەم زووانە ئاشتی بگەڕێتە وڵاتەکەمان و هەرکەسێ بگەڕێتەوە سەر جێگەو ڕێگەی خۆی و ئەم شەڕە کۆتایی پێ بێ و مقەڕەکانی ئەوانیش بگرێتەوەو کادیرەکانی ئەوانیش بێنەوە بۆ جێگاکانی خۆیان، بەڵام بە ماوەی زەمەنی..

• لە دیدارەکەمان لەگەڵ بەڕێز مام جەلال، ئاماژەی بۆ لایەنێکی عیراقی کرد. ئایا جەنابتان تا چ ڕادەیەک دەتوانن تیشک بخەنە سەر ئەم مەسەلەیە؟

•• لە ڕاستیدا من خۆم خەبەرەکەم هەروا لابەلا بیستووە، یەعنی دەنی هەواڵەکەی بەغدام نەخوێندۆتەوە تا بزانم چۆنە. یەعنی عیراق ئامادەیی خۆی دەربڕیوە بۆ ئەوەی گوایە ناوبژی لەبەینی ئێمەو پارتی‌دا بکا، ئێمە لای خۆمانەوە... من ئەمە ڕای شەخسی



خۆمە... لە سەرتاسەری دنیاوە هەرکەسێ بێ بۆ ناوبژی من پێشوازی لێ دەکەم، تەنها ڕژێمی بەعدا نەبێ. چونکە تەنها ئەوان ئیستفادە ئەکەن لەم شەڕوشۆڕەو ئەیەوێ بەهۆی ئەم شەڕوشۆڕەوە جارێکی کە بێتەوە بۆ کوردستان.

• بەنیسبەت ئێمەوە پرسیارمان نەماوە، ئەگەر جەنابتان شتێکتان پێ بێ بیڵێن.

•• من جارێکی تر زۆر سوپاستان ئەکەم بۆ هاتنەکەتان، حەز ئەکەم خەڵکی هەولێر دڵنیابێ لەوەی من چەندە خەڵکی سلێمانیم خۆش ئەوێ، خەڵکی هەولێریشم خۆش ئەوێت و ئێمە هەموومان یەک میللەتین، ئێمە چەند میللەتێک نیین، هەرچی چاکەیەکم بۆ سلێمانی ئەوێت بۆ هەولێریشم ئەوێت. یانی ئەگەر ڕۆژێ لەڕۆژان، من لێرەوە باسی ئەوە ئەکەم.. ئەگەر لەوێ پێویستی یەک بە من هەبێت من ئامادەم بێم لەوێ دابنیشم، خزمەتی خەڵکی شاری هەولێر بکەم، وە ئومێدم وایە کە زۆر بەزوویی لە شاری هەولێر ئاسایی بێتەوە، ناخۆشی تێپەڕێت، ئەم شەڕە کۆتایی پێ بێت. ئاشتی و ئاسایش بگەڕێتە وڵاتەکەمان و حکومەت سەرلەنوێ دەست بکات بە ئیشکردن، حکومەتی قانون دابمەزرێت، میلیشیا نەمێنێت، ئەمە ئومێدەکانی منە، ئومێدم وایە ئێوەش سەرکەوتوو بن، زۆر سوپاس.

# پارتی بۆچی ئەم شەڕەی هەڵگیرساندەوە؟

پارتی بەدوای بیانویەکدا دەگەڕا بۆ
هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی پاریس و باشترین
بیانووش هەڵگیرساندنەوەی شەڕ بوو.

یەکێتی و پارتی دوو هێزی هاوچارەنووسن. چەندی
شەڕ لەگەڵ یەکتری بکەن. سەرەنجام هەردەبێ
پێکەوە بژین و پێکەوە کار بکەن.

پاش گفتوگۆیەکی دوور و درێژی هەردوو مەکتەبی سیاسی ی.ن.ک و پ.د.ک دوو ڕێککەوتننامەی گرنگ ئیمزاکرا: یەکێکیان لە پاریس و ئەوی تریان لە پەرلەمان. جێبەجێ کردنی ئەم دوو ڕێککەوتنە هۆکانی هەڵگیرساندنەوەی شەڕی بنبڕ دەکردو بناغەی حکومەتێکی شارستانی نوێی دادەمەزراندو، قانون و نیزامی لە کوردستاندا جێگیر دەکرد. ئەم ڕێککەوتنانە چارەی بۆ زۆری ناکۆکی یەکانی نێوان یەکێتی و پارتی و، گیروگرفتەکانی ئەم قۆناغەی ژیانی خەڵک دانابوو.

جێگای داخە، ڕێککەوتننامەکان، دوای ئیمزاکردنیشیان، هەر لەسەر کاغەز مانەوە و، جێبەجێ نەکران، من هاودەنگ لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوڕێکانم، بۆ جولاندنی هەلومەرجی ڕاوەستاوی سیاسی کوردستان بەرەو پێشەوە، لە وتارێکدا ۷ پرسیار یا بڵێین ۷ ئیتیهامم ئاراستەی پارتی کردبوو. لە وتارەکەدا تکام لە برایانی پارتی کردبوو کە وەڵامی سیاسی بۆچی یەکان بدەنەوە، بەڵام ئەوان بە گوللە لە مەیدانی شەڕەوە و، بە جنێوی سوک لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە وەڵامیان دایەوە.

سەرەڕای ئەوەش من و کاک کۆسرەتیان تاوانبار کرد بە هەڵگیرساندنی شەڕ. بەمەش دەیانەوێ دەستە خوێناوی یەکەی خۆیان بەسەر ئێمە بسرن !.

جێبەجێ کردنی ئەم دوو ڕێککەوتنە بەهیچ جۆرێ بە قازانجی تایبەتی پارتی نەبوو، هەروەها بە قازانجی خاوەن ئیمتیازەکانی ناو یەکێتیش نەبوو. لە کاتی گفتوگۆکاندا کە نوێنەرانی پارتی یەکێ لەو



مەسەلانەیان ئەسەڵماند، مەتەتێکی گەورەیان بەسەر نوێنەرەکانی یەکێتیدا نەکرد، چونکە بێبەشی ئەکردن لە زۆر دەسکەوت و ئیمتیازی حیزبی. کۆسرەت و من و هاوڕێکانی ترمان زۆر ماندوو بووین بۆ ئاشتی. هەندێ جار لەسەر حیسابی کەرامەتی شەخسی خۆمان. بەڵام هەمو جار وایان ئەزانی بۆ دەستکەوتی شەخسی یە یا ڕەنگدانەوەی ناکۆکی یەکانی ناو خۆمانە. هیچ جارێ وایان حساب نەکرد لەبەر خاتری قازانجی کوردە.

ئێمە نەبووین کە شەڕمان هەڵگیرساندەوە، ئەوە پارتی بوو کە شەڕی هەڵگیرساندەوە بۆ ئەوەی لە ژێر باری قورسی ئیلتیزاماتی ڕێککەوتنەکان دەربچێ. والێرەدا چەند بابەتێکی سەرەکی ڕێککەوتنەکان کە بە قازانجی پارتی نین، بۆ نمونە ئەخەمە بەرباس و لێکۆڵینەوە :

## ١- کێشەی ڕابەرایەتی

کە قانونی هەڵبژاردنی گشتی دانرا، قانونی هەڵبژاردنی ڕابەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردیشی لەگەڵ دانرا.

قانونی دووەم شتێکی زۆر دواکەوتوو بووە لەگەڵ ژیانی دیموکراسی و گیانی سەردەم نەئەگونجا. هەوڵێکی زۆر درا بۆ گۆڕینی بە قانونی

هەڵبژاردنی سەرۆک یا حاکمی ئیقلیم یا والی. پارتی هیچ کام لەو پێشنیارانەی قبوڵ نەکرد، چونکە بەپێی هەڵسەنگاندنی سەرانی پارتی. کاک مەسعود بەسوێندی هەڵبژێردرا بە«ڕێبەر».

پارتی زۆر زیرەکانە توانی «ئیبتیزازی» یەکێتی بکاو، ناچاری بکا ئەم قانونە دواکەوتووە بەنابەدڵی قبوڵ بکا، هەڵبژاردن کرا.

سەرەڕای ئەو هەموو ئەزموونەی پارتی لەدەسکاری کردنی مەرەکەبەکەداو، لەدەنگداندا، بەتایبەتی لە بادیسان کردی، کاک مەسعود دەنگی پێویستی نەهێنا ببێتە ڕێبەر، خەریک بوو هەڵبژاردنەکە هەڵبوەشێننەوەو، جەوێکی گرژو ئاڵۆزاوی وەهایان خولقاند نزیک بوو لەسەرانسەری کوردستاندا ببێتە شەڕی ناوخۆیی.

کێشەی ڕێبەر وەکو گرێکوێرەیەکی چارەنەکراو مایەوە، باجی بۆشایی ئەم دەسەڵاتە خەڵکی کوردستان ئەیان دا، هەروەکو نموونە لەهەموو پارێزگای سلێمانیدا تەنیا ٦ حاکم هەیە، لەبەر ئەوەی نە ڕێبەرو نە سەرۆکمان هەبوو، کەس نەیتوانی حاکمی تر دابنێ تا کاروباری خەڵک ڕاپەڕێنن.

هەردوولا واڕێککەوتن «دەستەی سەرۆکایەتی» پێک بهێنن.

پەرلەمان بۆ ئەم مەبەستە قانونێکی دانا، ئەم دەزگایەش ئەبو لە ٨ کەس پێک بێ. ناوی ٨ کەسەکە دیاری کرا، هێشتا ئەندامەکانی ئەم دەستەیە سوێندی قانونییان نەخواردبوو، کاک مەسعود بەهانەیەکی دۆزیەوە، بەیەکجاری پەکی خست و نەی هێشت بکەوێتە کار، ئەم دەستەی سەرۆکایەتی یە، هەرچەندە لاسایی کردنەوەی



«مجلس قيادة الثورة»ی عیراق بوو، بەڵام ئەگەر بەگەڕیش بکەوتایە، نەیئەتوانی لەئاستی پێویستی یەکانی کوردستاندا بێت، چونکە ئەمەش «نیوە بەنیوە» بوو.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە لەپاریس هەردوولا واڕێککەوتن کە:

- لەباتی وشەی ڕێبەر، وشەی سەرۆک یا شتێکی تر بەکاربهێنرێ.

- هەڵبژاردنی داهاتوی سەرۆک و ئەنجومەنی نیشتمانی لەکاتی قانونی خۆیدا بکرێ، بەگوێرەی ئەنجامەکانی هەردوولا حکومەتێکی ئیئتیلافی پێک بهێنن.

- تا کاتی هەڵبژاردن «دەستەی سەرۆکایەتی» لەسەرۆکەکانی هەر ٣ دەسەڵات: تەشریعی، تەنفیزی، قەزائی پێک بهێنرێ.

بۆ ئەوەی کە هەڵبژاردنەکە لەکاتی خۆیدا بکرێ، «سەقفی زەمەنی» دیاری کرا بۆ ئەنجامدانی «سەرژمێری گشتی» دانیشتوانی کوردستان.

ئەمانە هەنگاوی گرنگ بوون بەرەو چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەی «ململانێی دەسەڵات» بەڕێگایەکی دیموکراتی و شارستانی.

پارتی قازانجی لەوەدا بوو هەلومەرجی کوردستان وەکو هەبوو بمێنێتەوە، چونکە قازانجی لەپاشاگەردانی ململانێی نادیموکراتی دەسەڵاتدایە.

پارتی بۆ بیانویەک ئەگەڕا خۆی لە ڕێککەوتننامەکان ڕزگار بکا. باشترین بیانوش هەڵگیرساندنەوەی شەڕ بوو.

## ٢_ کێشەی میلیشیا

لە دوای ڕاپەڕینەوە یەکخستنی هێزی پێشمەرگەی جیاجیای حیزبەکان بوەتە یەکێ لە خواستە سەرەکییەکانی جەماوەر، لە کابینەی یەکەمدا وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە دامەزرێنرا، بە نیازی ئەوەی پێشمەرگە یەک بخات و هێزی پارێزگاری کوردستان پێک بهێنێ.

بە هۆی سەرەتای «نیوە بە نیوە» سوپای یەکگرتوو بە ڕادەی یەکەم لە چەکدارەکانی هەردوولا بە ئەندازەیەکی وەکو یەک دروست کرا.

کە بوو بە شەڕ، چەکداری هەر لایەک گەڕایەوە لای حیزبەکان. بۆ چارەسەرکردنی ئەمە لە پاریس هەردوولا ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە:

_ ناوەندی «تەجنیدی ئیجباری» لە پارێزگاکانی دهۆک، هەولێر، سلێمانی، کەرکوک بکرێتەوە، هەوالید بانگ بکرێ بۆ خزمەتی سەربازی، لەم هەوالیدانە سوپای پارێزگای کوردستان دروست بکرێ، هەروەها دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش لە مانە دروست بکرێنەوە.

_ میلیشیا هەڵبوەشێنرێتەوە، دابینکردنی گوزەرانیان بگوازرێنەوە بۆ دانیرەکانی تر، ئەواتەی بێ ئابێتەوە بەرەو ڕووی دانیرەی «ضمانی اجتماعی» بکرێنەوە.

_ بە شێنەیی وا بکرێ حیزبەکان‌کارو میلیشیایان نەمێنێ.

_ تەنیا حکومەت هێزی چەکداری‌ بێ.

ئەمانە تا چەند لەگەڵ سیروبۆچوونی پارتی دا ئەگونجێن؟

دوای ئەمەش هەردوولا لە دوا ڕێککەوتندا پێکهاتن لەسەر ئەوەی کە:

_ هێزە چەکدارەکانی هەردوولا بە تەدریج کەم بکرێنەوە.

_ تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٤ هەر لایەک هێزەکەی خۆی کەم بکاتەوە بۆ ١٥ هەزار چەکدار.

_ سەرەتای ساڵی ١٩٩٥ جارێکی تر هەردوولا پێکەوە دابنیشنەوە بۆ دانانی قۆناغێکی تری کەمکردنەوەی میلیشیاکان.

کەچی هەر ڕاستەوخۆ دوای ئیمزاکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیە پارتی لەهەموو لایەکەوە کەوتە هەڵرشتنی پارەو، بەکرێ گرتنی ئەم و ئەو بۆ دروستکردنی «فەوجی کۆماندۆ»ی تازە. لە پاڵ ئەوەدا بڕیاری دامەزراندنی کولیەی جەنگی دا.

ئەمانە لەگەڵ ڕێککەوتنەکان ناگونجان، پارتی بۆ بیانوویەک ئەگەڕا خۆی لەم ڕێککەوتنانە ڕزگار بکا، باشترین بیانوش هەڵگیرساندنەوەی شەڕ بوو.

## ٣_ کێشەی دارایی

دوای ئەوەی حکومەتی کوردستان دامەزرا هیچ بیانوویەک بەدەس هیچ لایەنێکەوە نەما بۆ ئەوەی دەس بگرێ بەسەر سەرچاوەیەکی دارایی کوردستاندا. کاتێ ئەنجومەنی نیشتمانی دامەزراو، دوایی تر کابینەی یەکەم، تا چەند حەفتەیەک پارتی بروبیانوی ئەهێنایەوە بۆ ئەوەی

گومرکەکەی ئیبراهیم خەلیل هەر لەژێر دەستی خۆیدا گل بداتەوە، هەرچۆنێ بوو ئەوسا گومرکەکەیان دایەوە بە حکومەتی هەرێم.
لە سەرەتای مایسی ٩٤ وە کە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا، پارتی دەستی گرت بەسەر داهاتەکانی بادینان دا، لەوانە گومرکی ئیبراهیم خەلیل، یەکێتیش دەستی گرت بەسەر داهاتی سلێمانی دا، بەڵام داهاتەکانی سلێمانی هەر لە بانکەکانی حکومەت دا هەڵئەگیران، هەرچی یەکی لێ دەرهێنرابێ دیارە، هەموو کاتێکیش ئامادەبوون بۆ جەردو تەدقیق و لێپرسینەوە.
بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە لە پاریس هەردوولا ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی کە:
ـ داهاتی حکومەتی کوردستان هەمووی بگەڕێتەوە ژێر دەستی حکومەتی هەرێم.
ـ لە ١٩٩٤/٥/١ وە حیساب لەگەڵ هەردوولا بکرێ و، داهاتی ئەو ماوەیە چەند بووە، بگەڕێتەوە خەزێنەی حکومەتی هەرێم، ئەوەی خەرج کراوە لە پارەتی مانگانەیان دابشکێنرێ.
ـ دیوانی رەقابەی مالی دامەزرێنرێ.
لە دوا ڕێککەوتننامەکەش دا هەموو ئەوانە دووپات کراونەتەوە.
بەڵام ئەمانە هیچی بە قازانجی پارتی نەبوو، پارتی ئامادە نەبوو حسابی ئەو ماوەیەی پێشووی لەگەڵ بکرێ، هەروەکو ئامادە نەبوو داهاتەکە بخاتەوە ژێر دەستی حکومەت.
ئەمانە لەگەڵ ڕێککەوتنەکاندا ئەنەگونجان، پارتی بۆ بیانوویەک



ئەگەرا خۆی لەم ڕێککەوتنانە ڕزگار بکا، باشترین بیانووش هەڵگیرساندنەوەی شەڕ بوو.

## ٤ـ کێشەی نیوە بە نیوەی دامەزراندنی فەرمانبەران

لەبەر ئەوەی سەرکردایەتی پارتی ساڵانێکی درێژ، دوور لە کوردستانەوە بنکەیەکی فراوانی لەناو جەماوەردا نەمابوو، دوای ڕاپەڕین، کە گەڕانەوە، بۆ منافەسەی یەکێتی، ڕێگای جۆراوجۆری گرت بۆ ڕاکێشانی ئەندام و لایەنگر. یەکێ لەو ڕێگایانە سەپاندنی سەرەتای «نیوە بە نیوە» بوو لە هەموو بوارەکانی کاری ئەم دوو لایەدا، بەتایبەتی لە بواری دامەزراندنی موچەخۆردا، هەر لە سەرۆکایەتی وەزیرانەوە تا بچوکترین موچەخۆری حوالێ.
پاوانکردنی دائیرەکانی حکومەت لە لایەن ئەم دوو لایەوە، جگە لەوەی بێ عەدالەتی یەکی گەورەیە دەرهەق بە هاووڵاتییانی دەرەوەی ئەم دوو هێزە، دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی حکومەتیش بێبەش ئەکا لە کەسانی خاوەن توانا و کارامە و لێوەشاوە. نیوە بە نیوە دائیرەکانی ئیفلیج کردو کاریان لەسەر ئاڕۆیی.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە لە پاریس هەردوولا ڕێک کەوتن لەسەر ئەوەی کە:
ـ سەرەتای نیوەبەنیوە لابیرێ.
ـ وەکیەکی وەزیرو وەکیل و، بەڕێوەبەرو جێگرەکەی هەڵبوەشێنرێتەوە.
ـ «مجلس الخدمة العامة» دابمەزرێنرێ بۆ ئەوەی لێرەبەدواوە لەسەر بنچینەی لێهاتوویی، نەک تەزکیەی حیزبی، موچەخۆر دابمەزرێنن.
ئەمانە هیچی بەقازانجی پارتی نەبوون، چونکە پارتی لەسایەی نیوەبەنیوەو، وەکیەکی بەڕێوەبەرو جێگرەکەیەوە هەزاران موچەخۆری دامەزراندو بەلای خۆیا ڕایکێشا. ڕەنگە یەکێتیش هەمان شتی کردبێ. پارتی ئەگەر ڕێککەوتننامەکە جێبەجێ بکات، ئەبێ واز لەم ئیمتیازە بهێنێ، ئەشی ئەویست دەستی لێ هەڵبگرێ. بۆیە بۆ بیانوویەک ئەگەڕا کە خۆی لەم ڕێککەوتنانە ڕزگار بکا، باشترین بیانووش هەڵگیرساندنەوەی شەڕ بوو.
جگە لەو کێشەو ناکۆکییانە، هەردولا لەسەر زۆر مەسەلەی تر ڕێک کەوتن وەکو: یەکخستنی هەڵوێستی سیاسی لە ڕژێمی عیراق، لە حیزبە کوردییەکانی دەرەوەی عیراق، لە دەوڵەتانی دراوسێ، یەکخستنی دەزگای زانیاری و ڕێکخستنی تایبەت، حەرام کردنی کوشتنی تێکۆشەرانی یەکتری و، زمان دان لە یەکتری..
هەر زوو، هەندێ کەسی ژیرو شارەزا کە دەقی ڕێککەوتننامەکانیان



بینی بە دوودڵی بەوە وتبان: ئەمە ئیرەشی جێبەجێ بکرێ باشە، چونکە پارتی ناچێتە ژێر باری ئەو ئیلتیزاماتەوە!
دەرکەوت ئەوانە گومانەکەیان لە جێی خۆیا بوو، پارتی بۆ ئەوەی ڕزگاری بێ لەو ئیلتیزاماتە شەڕی هەڵگیرساندەوە.
لێرەدا بە پێویستی ئەزانم دڵسۆزانە عەرزی سەرکردایەتی پارتی بکەم: یەکێتی و پارتی، خۆیان پێیان خۆش بێ یا پێیان ناخۆش بێ، دوو هێزی هاوچارەنووسن، ئەرک و لێپرسراوێتی مێژوویی ئەم قۆناغەیان لە ئەستۆدایە، چەندی شەڕ لەگەڵ یەکتری بکەن، سەرەنجام ئەبێ ڕێگای گفتوگۆو لەیەک گەیشتن و پێکەوەژیان و پێکەوە کارکردن هەڵبژێرن، بۆیە هەتا زووتر ئەو ڕێگایە هەڵبژێرن باشترە.

# کۆنگرەی ڕۆژنامەنوسی

**سەرەتای مانگی یانزەی ساڵی 1994 لەسلێمانی**

پرسیار؛
کاک ئەوشیروان، بارودۆخی ئەمڕۆ دوای هەوڵدان بۆ ئاسایی کردنەوە جۆرە مەیینێک و جۆرە سستی یەکی تیا ئەبینین، وە زۆرجاریش لەملاو لەولاو لەڕووی ڕۆژنامەکان.. لەسەر ڕووی ئەو مەنشوراتانەی کە دەردەچن باسی ئەوە دەکەن کە ئاسایی کردنەوە جگە لە شەڕ وەستان هیچ هەنگاوێک نەچووەتە پێشەوە. سەبارەت بەئاسایی کردنەوە، ئەو گیروگرفتانە چین کە هاتونەتە ڕێ و سوود بەوەزعەکە ناگەیەنن.

●● یەعنی ئەگەر بڵێین ئاسایی کردنەوە هیچ نەچووەتە پێشەوە.. چووەتە پێشەوە. بۆ نمونە پارتی لەناوچەی سلێمانی و کەرکوک مەقەڕەکانی خۆیان وەرگرتووەتەوەو چوونەتە ناویەوە. لەشارێکی وەکو

سلێمانیدا هەموو کارمەندو موەزەف و موچەخۆر هەموویان گەڕاونەتەوە سەر وەزیفەکانیان... خانووەکانیان لەسەرحەمی ٢٨ خانو ٢٢ خانویان دراوەتەوە کە داگیرکرابوو، خانووەکانیان لەشوێنەکانی تریش، لەدهۆک مەڵبەندی ڕێکخستن کراوەتەوە... هۆی بەجووبەپێشەوەی وەزع لەڕاستیدا ئەگەڕێتەوە بۆ پارتی. یەعنی پارتی پێیان خۆش نیە حکومەتی قانون لەکوردستاندا هەبێت. پێیان خۆشە ئەم وەزعە بەم شێوەیە بمێنێتەوەو حکومەتی میلیشیا هەبێت. وە پارتی یەکێکە لەو حیزبانەی کە بەداخەوە ئیحترامی هیچ ئیتفاقێک ناگرێت. لەهەموو ئیتیفاقێکدا تەنیا ئەوانە جێبەجێ دەکات کە لەمەسلەحەتی حزبەی دایە.. ئەوەی کە لەمەسلەحەتی یەکێتی بێت یا لەمەسلەحەتی کورد بێت ئەو بەخەیاڵیا نایەت، تەنیا ئەو بەندانە جێبەجێ ئەکات کە مەسلەحەتی حیزبەکەی خۆیەتی، کەخۆی پێ بەهێز ئەبێت، خۆی پێ بەقوەت دەبێ، دەسەڵاتی خۆی پێ زیاد ئەکات. ئەوە سەبەبی ئەساسی‌یە کە وەزعەکە ناچێتە پێش. ئەوان گلەیی لەوە ئەکەن،، ئەڵێن، ئەوان لەفلانە جێگا نەگەڕاونەتەوە،، مەسەلەن ئێمە هەتاکو ئێستا خانووەکانی خۆمانیان نەداوینەتەوە لە هەڵەبجە، هەتا ئێستا ڕێکخستنەکانی ئێمە نەگەڕاونەتەوە بۆ تەوێلەو بیارە، لەهەموشی موهیمتر ئەوەیە وەختی خۆی ئێمە لەکۆبونەوەیەکی موشتەرەکی هەردوو مەکتەبی سیاسیدا وا ڕێککەوتین کە ئەوان گومرکی ئیبراهیم خەلیل تەسلیمی حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەن، بەموقابیل ئێمە مەقەڕاتیان ئەدەینەوە لە



سلێمانی. ئەوان ڕازی بوون کە ئێمە مقەڕەکانیان بدەینەوەو ئەوانیش گومرکی ئیبراهیم خەلیل بدەنەوە بەحکومەت. ئەوا زیاتر لەمانگێکە هەموو ڕۆژێک ئەوان وارداتی گومرکی برایم خەلیل ٨١ ملیۆن دینارە لەڕۆژێکدا!!،، ئەم مانگە حکومەتی هەرێم مەعاشی نیە بیدات بەموەزەفەکانی هەرێم، تا ئێستا، ئەوان مانیان گرتووەو دەستیان گرتووە بەسەریدا بۆ خۆیانی هەڵدەگرن. یەعنی بەشی حکومەتی هەرێمیان لێ نەداوەو تەسلیمی هەرێمیان نەکردووە، یەعنی تەشیع لەو موقتانە ناچێتە پێشەوە کە پارتی ئیستغلالی کردووە...

پرسیار:

بەڕاستی ئەمەوێ لەبارەی ئەم وەزعەوە، بۆ خۆم تەسەوری ئەوە ناکەم هاوپەیمانێتی یەکێتی‌و پارتی لەئەسڵا ببێتە هاوپەیمانێتی‌یەک کە ناوی ببرێت هاوپەیمانێتی... دیارە هۆکارەکانیش، با بگەڕێینەوە بۆ شەستەکان هەتاکو ئێستا بەکۆمەڵێک عیلاقاتی عەشایری‌و تێکەڵاوبوونی ئەو دوو حیزبە لە هەندێ ڕووەوە کە ناکرێت یەکێکیان لەوی تریان بەعەقلیەتێکی دەمارگیری یا عەقلیەتی کۆن یا خێڵایەتی لەگەڵ یەک دەکەن... بۆ ئەوەی شتێ بکرێ کە بەحەقیقەت ناوی هاوپەیمانێتی بێ، پێویستە لەسەرەوە ئیش بکرێت.. جا کاتێک کە ئێمە دەڵێین پارتی نایەوێت ئەوە بکات یا یەکێتی نایەوێ ئەوە بکات شتێکمان بۆ دەردەکەوێت کە نازانین کێ تاوانبارە.. لەڕاستیا هەموو مەسئولیەتەکە لەسەرشانی ئەو دوو شەخسەیە، وە نمونەشمان هەیە بۆ

ئەوە، جا ئێمە ئەتوانین ئیش بکەین کە کار لە عەقلیەتی ئەو دوو زاتە بکەین کە وەزع و تەتبیع بۆ پێشەوە بچێ یان نا.

●● کاکە تۆ چەند مەسەلەیەکت ئیشارە کرد.. جارێ یەکەم ئەو شەڕانە کە هەڵگیرساون لە بەینی یەکێتی و پارتیدا من پێم وانییە کە لەسەرەوە دەستی پێ کردووە. لەخوارەوە هەڵگیرسان و سەرەوەی تێوە گلا.. مەسەلەی هاوپەیمانێتیش پێم وایە ئەگەر هەز لە چارەی یەکتریش نەکەین، وەکو دوو دراوسێ هەز لەچارەی یەکتر نەکەن، ئەبێ پێکەوە بژین... ئێمە دوو حزبین دوو نەهجی جیاوازین، دوو بەرنامەی جیاوازمان هەیە، دوو بۆچوونی جیاوازمان هەیە بۆ پاشەڕۆژی کورد، بۆ ئێستای کورد.. بۆ چارەسەرکردنی وەزعی خەڵک.. لەبەر ئەوە خۆ ئەگەر لەهەموو شتێکدا تەتابق لە وجهەنەزەری هەردوولاماندا هەبوایە،، ئەوا دەبووین بە یەک حیزب.. بەڵام لەبەر ئەوەی تەتابق لە وجهەنەزەری هەردوولاماندا نیە، بۆیە ئێمە دوو حیزبین بۆچوونەکانمان جیاوازە. هەندێ بۆچوونمان هەیە مشتەرەکە لەیەک دەچێت، هەندێکمان هەیە جیاوازە. ئەوە بووە بە سەبەبی کە جاروبار پێکەوە بەیەک مەوقفی مشتەرەک بێینە پێشەوە، جاروبار موقفەکانمان زۆر متەناقض و جیاوازە لەگەڵ یەکتری دا.. ئەوەی لەرابوردوودا رووی دا من ناسەوێ بچمەوە سەری چونکە لە کۆڕەکەی پێشوودا باسمان کرد، بەڵام من پێم وایە لەسەرەوە زۆرتر تەبایی هەیە، لەیەک گەیشتن هەیە، لەخوارەوە زۆرتر نیە.. یەعنی



جارێک برادەرێک تەشبیهی عیلاقەی بەینی ی ن ک و پارتی کرد بە شکلی هەرەم، ووتی ئەو عیلاقەبە دۆستانەیە، وەکو چۆن لەقیممەی هەرەمدا ئاوا یەک دەگرنەوە، هەتا دێتە خوارەوە بۆ ناو قەواعیدی هەردو حیزبەکە، چۆن قاعیدەی هەرەم فراوان دەبێت، ئەوانیش ئاوا فراوان دەبێتەوەو لێک دوور دەکەونەوە. .. لەکاتی شۆڕشیشدا کاتێ شەڕ دەستی پێکردووە لەبەینی حزبە سیاسیەکانی ناو کوردستانی عیراق داە بڕواتان بێت جار وا هەبووە بێ بەرنامە بووە، یەعنی لەخوارەوە دەستیان پێ کردوو، لەسەر دوو تفەنگ، لەسەر سەرانە لە دێیەک، لەسەر ئەنجومەنی ناوایی یەک بووە، وردەوردە وای لێهاتووە تەنیوەتەوەو گەیشتووەتە سەرکردایەتی، سەرکردایەتیەکانیش پەلاماری یەکتریان داوە. ئەمجارە نەگەیشتووەتە ئەوەی سەرکردایەتیەکانیش پەلاماری یەکتری بدەن. . من حەزیش ئەکەم ئەوە بزانن کە کۆبونەوەی دووقۆڵی مام جەلال و کاک مەسعود نەبووە بەهۆی ئەوەی شەڕ رابوەستێ، بەڵکو تەهدیدی ئەمریکی بوو. . یەعنی یەکێتی لەترسی پارتی نەبوو کە شەڕی راگرتووە، پارتیش لەترسی یەکێتی نەبووە کە شەڕی راگرتووە. ڕەنگە قەواعیدی هەردوولا پێیان وابووە کە ... بەڵام شەڕ کە راوەستاوە ئەوە نیە کە نیەتی باشی فلان ئینسان، یاخود لێکدانەوەی مەسلەحەتی ئەمنی قەومی کورد، بەڵکو ئەمریکاییەکان تەهدیدی هەردوولایان کرد کە واز لەکوردستانی عیراق دەهێنن و بەحێی دێڵن و منظماتی ئەجنەبی لەکوردستان دەچنە دەرەوە، سەدام پەلامار بدات لەسەرمان ناکەنەوە، لەبەر ئەوەشە کە

ڕاگیراوە... دیارە هەردوو مەکتەبی سیاسی دانیشتن لەسەر کۆمەڵێک شت ڕێککەوتنیان کرد، ئێمە ڕۆیشتین بۆ پاریس ئیتیفاقێکمان ئیمزاکرد... من وەکو عەرزم کردن پارتی حزبێکە ئیلتیزام بەئیتیفاقەوە ناکات، ئیحتیرامی هیچ ئیتیفاقێک ناگرێت ئەگەر مەسلەحەتی خۆی تیا نەبینێت. یەعنی هیچ بەندێکی جێبەجێ ناکات ئەگەر مەسلەحەتی خۆی تیا نەبینێت. ئەم جیزبە ئیتر من بەحەڵک دەڵێم، چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت؟، یەعنی ئەگەر ئیتفاقێک جێبەجێ نەکات چۆن ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەین...؟

پرسیار:

ئەو بڕیارانەی کە ئەدرێت لەڕووی سیاسی و لەڕووی ئیداری و لەڕووی ئەمنی‌یەوە، خەڵکەکە ئەو ئیهتمامەی پێنادەن، چونکە دوای ئەوە ساردبوونەوەی تیا ئەبینێت.. باشە ئەگەر بڕیارە سیاسی‌یەکان،، مەخرەج چی‌یە بۆ ئەوەی لەم بێئومێدی‌یە ڕزگاربێت..

** ئەوەش دیسانەوە دەگەڕێتەوە بۆ پارتی. ٣ مانگ زیاترە باسی ئەوە دەکرێت کە تەعدیلی وەزاری بکرێت.. هەروەکو ئەزانن ئەم وەزارەتەی کە ئێستا هەیە، نە بەمەعنای تەواو وەزارەتێکی سیاسی‌یە بڵێین لەپیاوە دەسەڵاتدارەکانی ناو هەردوو مەکتەبی سیاسی دروست کراوە، نە ئەوەبە بڵێین لەخەڵکی فەنی تەکنۆکراتی دروست کراوە. لەبەر ئەوە نیشەکانیان لەبەر ناڕوات، بڕیاریش هەتاکو ئێستا بەدەست



وەزارەت نیە، بڕیاری سیاسی لەدەرەوەی وەزارەت ئەدرێ، هەردوو مەکتەبی سیاسی ئەیدات. ٣ مانگ لەمەوپێش باسی ئەوە هاتە پێشەوە کە ئەم وەزارەتە بگۆڕرێت بە وەزارەتێک کە پیاوە دەسەڵاتدارەکانی هەردوولا تیا بەشداری بکەن، بەتایبەتی مام جەلال و کاک مەسعود بەشداری بکەن لەوەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی پەرلەمان.. لەپێشا کەسیان ڕازی نەبوون، لەدوایی‌دا مام جەلال قەناعەتی کرد، کاک مەسعودیش هەتا حەددێک قەناعەتی کرد، لەبەر ئەوەی ئێمە چاوەڕوانی ئەوەمان کرد کە سەفەرێکی دەرەوە بەدەستەوە بوو بچن بۆ سەفەرەکە. پاش ئەوەی کە هاتنەوە لەهەندێک دۆست بپرسن کە ئایا بیکەن یا نەبکەن. دۆستەکان لەدەرەوە وەڵامیان دایەوە کە بیکەن باشترە.. ئێمەش هەموومان پێمان باشە، ئەوە ئەگەر بیکەن دەبێتە حکومەتێکی حەقیقی و پەرلەمانێکی حەقیقی... لەسەر ئەوە هاتبووینەوە لە کۆبوونەوەیەکدا دابنیشین، کاک مەسعود بڵێ ئەیکەم یان نایکەم، بۆ ئەوەی تەعدیلە وەزاری‌یەکە ببێت، چونکە لەو حاڵەتەدا ئەگەر ئەو کردی نەوعێکی تر کابینە تەشکیل دەبێ، ئەگەر نەیکرد مەوعێکی تر تەشکیل دەبێ. ئەوا ٣ مانگە چاوەڕوانی ئەو زاتەین ئەو وەڵامە بداتەوە، تاکو ئێستا جوابی نەداوەتەوە. ئیتر نازانم لەم سێ چوار ڕۆژەدا وەڵام ئەداتەوە یان نا، بەکردن یان بەنەکردن... ئەگەر ووتی ئەیکەم هەرکامێکیان وەریگرێت سەرۆکایەتی کابینە یان سەرۆکایەتی پەرلەمان، بەسبەبەت یەکێتی‌یەوە فەرق ناکات، بەقەناعەتی من ئەو دوو زاتە لەپەرلەمان و وەزارەتدا بەشداری

ئەکەن سەرلەنوێ هەر وەزارەتێکی تر دروست بێنێت وەزارەتێکی راستەقینە نابێت، چونکە پەرلەمانێکی حەقیقی نایێت، چونکە دیسانەوە بڕیاردانی سیاسی لەدەرەوە ئەمێنێنەوە، وەزارەتەکان ئیشەکانیان ناڕوات، وەکوو ئەم وەزارەتەی ئێستای لێ بەسەردێت.. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم وەزیر و وەزارەتانەی ئێستا بێ توانان، دیارە تیایەتی هەندێکیان زۆر بێ توانان، بەلام عیلاقەی بە تواناو بێ توانایی ئەوانەوە نیەو بڕیاردانی سیاسی بەدەست ئەوان نیە، بەدەست مەکتەبی سیاسی یەکەیە، ئەم رکودە وەکو بۆم باس کردن ۳ مانگە ئێمە راوەستاوین کە ئەیکا یان نایکا، تا وەزارەتەکە گیانی تێ بکەرێتەوەو بکەوێتەوە ئیش.. چونکە ئەمانەی ئێستا خۆیان بەموەقەت دەزانن ئەگۆڕین .. لەبەر ئەوە ئیشەکان باش ناڕوات. مامۆستا ئەحمەد ئەوان زیاتر مبرری قانونی دێننەوە.. ئەوە مبررێکی ناراستە، پەرلەمان مەخرەجێکی قانونی دۆزیەوەو لائیحەی قانونەکەشیان ئامادە کردبوو؛ ئەو دوو جوامێرە هەردووکیان لەلیستی خۆی کە (۱۰۰) کەسە ، لەهەموویان زیاتر دەنگیان هێناوە، لەبەر ئەوە هیچ مبررێکی قانونی نیە، پەرلەمان خۆی مشرعە، خۆی ئەتوانێ بەقانونێکی تر ئەوان بێنێتە ناو پەرلەمانەوە... ئەو بیانووە وەکو ئەڵێن بیانوی ( ) نانی جۆیە.

لەوەلامی پرسیارێکدا:



●● من ناتوانم لەباتی پارتی وەلام بدەمەوە، بەکێتی بەهەموو توانای حزبەوە هەوڵی داوەو هەوڵ ئەدات کە حکومەت سەرکەوتووبێت و پەرلەمان سەرکەوتووبێت و بتوانن ئیشەکانی خۆیان بکەن و لاکەی تر(پارتی) خۆیان بەرپرسیارن.

پرسیار:
ئایا دەکرێت گەر کاک مەسعودیش رازی نەبوو، ئەوا مام جەلال یەکێ لەپۆستەکانی سەرۆکایەتی پەرلەمان یا حکومەتی هەرێم بگرێتە دەست و کاک مەسعود بخاتە بەردەم ئەمری واقع ؟

●● نەخێر ناکرێت، چونکە ئەو کاتە پارتی مەجموعەیەک وەزیری بۆ دائەنێت بۆ ئەوەی مام جەلال فەشەل بکات، لەبەرچاوی خەڵک، وە بۆچی ئێمە بەدەستی خۆمان کارێکی وا بکەین، چۆن ئێستا کۆمەڵێک خەڵکی داناوە.. ئەوسا کۆمەڵێک خەڵکی تر دائەنێت بۆ ئەوەی تەگەرە دروست بکەن و بڵێن ئەوا مام جەلالیش فەشەلی کرد.. ئەگەر کاک مەسعود ئەیکا حەق نیە مام جەلالیش هیچ ئیشێک بکات.

پرسیار (رۆژنامەی الاتحاد):
تاکەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەم شێوە لاوازە بمێنێتەوە، بۆچی ئەو دوو حیزبە یارمەتی نادەن و حەیبەتی بۆ پەیدا ناکەن ؟.

•• بۆچی ئەوەی کە وەزارەت بەقوەت ناکەین، وەکو عەرزم کردن ئەوە بەدەست ئێمە نیەو هەیبەتی حکومەتیش بەدەست ئێمە نیە، بەشی زۆری ئەکەوێتە سەرشانی پارتی.. من وەکو عەرزم کردن پارتی حەز ناکات قانون هەبێت، حەز ئەکات بێ قانونی هەبێت، حەز ئەکات حکومەتی میلیشیا هەبێت.. ئەمانە فێری ئەوە نەبوون لەناو وڵاتێکدا بژین کە قانون و نیزام و ئەوانەی تیابێت،، حەز دەکەن ئەو دامودەزگایەی دروستیان کردووە بەئارەزووی خۆیان عیلاقەتی خارجی بکەن، بەئارەزووی خۆیان کومرک بەرن، بەئارەزووی خۆیان چەکداریان هەبێت، بەئارەزووی خۆیان حەبسخانەیان هەبێت، بەئارەزووی خۆیان رەلام تیروورکەن، بەئارەزووی خۆیان کەمین دابنێن خەڵک بکوژن، هەڕەشە لە عەشایەر بکەن... جا ئەم حزبە چۆن لەقاڵبی قانون ئەدرێ.. من نازانم. یەکێتی لای خۆیەوە پێی خۆشە دەوڵەتی نیزام و قانون هەبێت، پێی خۆشە هەیبەتی قانون هەبێت، حکومەت و مونەسەسەکانی حکومەت کاروبارەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن.

پرسیار
ڕێککەوتننامەی پاریس هیوایەک بوو لای خەڵک، بەڵام وا خەریکە ئەو هیوایەی لای خەڵک نامێنێت، هۆی دواکەوتنی چی یە؟.

•• حەز دەکەم چیرۆکی ئەم ڕێککەوتننامەیە بگێڕمەوە تا خەڵک باشتر ئاگادارین... بەتەواوی ئاگاداری حەقیقەتەکان بین و بزانن چۆن



بووەو چۆن نەبووە..
کە شەڕ لەکوردستان بەردەوام بوو، من خۆم یەکێک بووم لەوانەی کە لەدەرەوە بروم، مام جەلالیش یەکێک بوو لەوانەی کە لەدەرەوە بوو. ئێمە زۆر لامان گرنگ بوو کە شەڕ ڕابوەستێت، حەموومان پێمان وابوو شەڕ حەنەرێکی زۆر گەورەو ماڵوێرانکەرە بۆ گەلەکەمان و لەوانەیە بێتە هۆی ئەوەی کە ئەم تەجروبەیە لەڕەگ وریشە دەربهێنێ وە پێشمان وابە کە ئەم وەزعە فرسەتێکی مێژوویی یە بۆ گەلەکەمان هەڵکەوتووە، ئەگەر لەکیس بچێت لەم قەرنەدا فرسەتی وامان بۆ نایەتەوە.
وە ئەگەر ئەم تەجروبەیەمان لەناوبچێت، بروخێت. لەئەنجامی ئەوە کە عیراق بێت غەزومان بکات و دەرەقەتی نەیەین، کەس لۆمەمان ناکات، لەئەنجامی ئەوەی تورک بێت وڵاتەکەمان داگیربکات کەس لۆمەمان ناکات، لەئەنجامی ئەوەی کە ئێران بێت وڵاتەکەمان داگیربکات کەس لۆمەمان ناکات. بەڵام ئێمە بەدەستی خۆمان،، خۆمان حکومەتەکەی خۆمان بروخێنین ئەک لۆمەمان ئەکەن،، ئەجیالی داهاتوو ئەعلەتیشمان ئەکەن... لەبەر ئەوە ئێمە حەریص بووین، سوور بووین لەسەر ئەوەی کە ئەم شەڕە زوو کۆتایی پێ بێت، لەبەر ئەوە ئێمە رجامان کرد کە ئەمریکایی یەکان وەساتەت بکەن لەبەینماندا، ناوبژی بکەن. ووتیان وەساتەت ناکەین بەڵام زەحمەت ئەکەین بۆ ئەوەی شەڕەکە ڕابگیرێت، بەلاشمانەوە گرنگ نیە کێ مەسئولە، بەلامانەوە گرنگە کە شەڕەکە ڕابگیرێت، داوامان لە ئینگلیز کرد، ئامادە نەبوون وەساتەت بکەن، داوامان لەئێران کرد، ئێران

ئامادە بوو وە دەعوەتی مام جەلال و کاک مەسعودیشی کرد بۆ تاران، کاک مەسعود نەچوو بۆ تاران ووتی لەم کاتەدا ولاتەکە بەجێ ناهێلم.. وە ئەوان ووتیان ئێمە میوانداریتان دەکەین وە وتیان وا دەکەین کە ئیتیفاقیەک مۆر بکەن وەکو ئەوەی سالی ١٩٨٦ لەنێوان خوالێخۆش بوو ئیدریس و مام جەلالدا کراو هەشت سالی خایاند، حەز دەکەین ئیتیفاقێکی وا لەبەینتانا ببینن کە هەشت سالی تر شەر نەبێتەوە لەنێوانتاندا... لایەنی پارتی، کاک مەسعود حازر نەبوو.

فەرەنسی یەکان مبادەرەیەکیان کرد بەسەرۆکایەتی سەرکۆماری فەرەنساو چەند کەسێکی کورد. پەیامێکیان هێنا، پەیامەکەیان بریتی بوو لەوەی کە فەرەنسا ئامادەیە میوانداری نوێنەرانی هەردوولا بکات لەشوێنێکی کەنار، کە بەشێوەیەکی نهێنی بەبێ ئەوەی لەلای رۆژنامە ئیعلان بکرێت، چونکە پێیان وابوو کە دوو ئیحتیمال هەیە، یەکێکیان ئەوەیە کە ئێمە بگەینە نەتیجەی ناوبژی کردنی ئەوان، ئیحتیمالی دوهەم ئەوە بوو کە ئێمە نەگەینە ئەنجام، نەگەینە نەتیجە خۆی لەخۆیدا ئەمە شکستە بۆ دیپلۆماسیەتی فەرەنسی.... چونکە فەرەنسا مەشهورە لەبواری دیپلۆماسیەتدا.

هاتن لەگەڵ هەردوو مەکتەبی سیاسی کۆبوونەوەو لەگەڵ هەردوو جوامێر (مام جەلال و کاک مەسعود) کۆبوونەوەو وتیان کە فەرەنسا ئامادەیە، نوێنەرانی هەردوولا بێنە پاریس. گفتوگۆ بکەن، ئەگەر گفتوگۆکەیان بەئەنجام گەیشت ئەوا لەدوایی دا هەردوکتان بانگ ئەکەین بۆ پاریس بەحزووری سەرۆک میتران حەفلەیەکی دیپلۆماسی زۆر



گەورە دەکرێت، لەوحەفلەیە دیپلوماسی یەدا ئیتیفاقیەکە ئیعلان دەکرێت لەبەرچاوی وەسائلی ئیعلامەوە ئیمزا دەکرێت وەکو ئەوەی لە واشینتۆن رووی دا، شتێک لەو بابەتانەوە، ئەوە سەرۆک میتران ئەیکا بە مناسەبەتێک بۆ ئەوەی داوا لە محتەمەعی دەولی بکات کە داوا بکرێت حەسار لەسەر کوردستانی عیراق لابرێت، خەتی 36 درێژ بکرێتەوە بۆ خەتی 34 . لەهەمان کاتدا بەتەلەفۆن لەگەڵ سەرۆک کلینتۆن قسە دەکرێت، لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا (جۆن مێجەر) قسە دەکرێت، ئەوانیش دەوری خۆیان بخەنە دەوری سەرۆک میتران. ئێمە چووین بۆ پاریس... لەپاریس پاش چەند رۆژ مشتومڕ گەیشتینە ئەوەی ئیتفاقێکمان ئیمزا کرد. لەو کاتەدا لەبەدبەختی کورد سەرۆک میتران لەخەستەخانە کەوت.

بەلام پارتی بەدڵیان نەبوو بچن بۆ پاریس، هەر لەبیدایەتەوە کە چووشین وەکو ئیحراج چوون، ئەوان دەیانوت ئێمە دەبێ موشکیلەکانی خۆمان لەناو خۆماندا حەل بکەین... ئێمە (یەکێتی) پێمان وایە خۆمان موشکیلەکانی خۆمان پێ حەل ناکرێت، ئێمە ئەگەر ئێران نەبوایە وەختی خۆی لەگەڵ پارتی رێک نەئەکەوتینەوە، چونکە تاکو نەچووین لەگەڵ ئێران رێک نەکەوتین پارتی لەگەڵمان رێک نەکەوت. لەبەر ئەوە ئەگەر تەرەفی سێیەمی تێدابێت هەمیشە شتێکی باشە.. یەعنی کە هاتبشنە پێشەوە بەنابەدڵی هاتنە پێشەوە، دەیانووت هێشتا ئەتبیع نەبووەو هیچ نەبووە ئێمە پەلەمان کردو ئەبوایە نەهاتینایەو ئەبوایە لەولاتی خۆمان دابنیشتینایە لەوێ موشکیلەکانی خۆمان حەل

بکردایە. وەکو بیستومە کاک ئیحیریش لەدووەمی شوێن تەسریحی دابوو لەلای هەندێک ڕۆژنامەنووسی بێگانە، لەلای ئێرانی یەکان وتبوی ئیتیفاقیەی پاریس سەر ناگرێت، دیاربوو لەبەیی خۆیاندا بڕیاریان لەسەر دابوو. لەپاریس ئێمە کە ئیتیفاقیەکەمان ئیمزا کرد ئەوە بوو مایەوە سەر ئەوەی ئەوان ئیمزای بکەن، ئەوەبوو سەرۆک میتران نەخۆش کەوت، فەرەنسی یەکان داوایان لێ کردین وتیان ئەمە وەکو وەثیقەیەکی سری لای خۆتان هەڵیگرن، ناوەڕۆکەکەی بڵاو مەکەنەوە تاکو ئەوان دێن بۆ پاریس تاکو وەکو شتێکی مفاجەئەی لێ بکەن...

لەگەڕانەوەماندا نوێنەری پارتی لەتورکیا کە سەفین دزەیی یە، وە ئەوەش رویتەر بڵاوی کردۆتەوە، نوسخەیەکی لەم ڕێککەوتننامەیە کە ئیمزای من و سامی پێوەیە کە بەزمانی ئینگلیزی و فەرەنسی نوسراوە، داوە بە تورکەکان ... خۆیان بیستیان لەوەساتلی ئیعلامدا تورکەکان چۆن تورەبوون، وتیان کورد ئەیانەوێ دەوڵەت دروست بکەن، وە نابێ ئیتیفاقی پاریس سەربگرێت. ئەوە نەتیجەی ئەوە بوو برادەرانی پارتی نوسخەیەک لەمەیان دابوو بەتورکەکان، وە ئەوانیش بەرەسمی ئیحتیجاجیان کرد لەلای فەرەنسا و وتیان فەرەنسی یەکان ئەیانەوێ یارمەتی کوردەکان بدەن بۆ ئەوەی جیابێتەوەو دەوڵەتی خۆی دروست بکات و ئەمەش دژی ئەمنی قەومی یەوە، لەهەمان کاتدا کۆبونەوەیەکی سێ قۆڵی یان لەگەڵ سوریاو ئێران ... هی وەزیری خارجی یەکانیان بەست، لەوێش تورکەکان سەرو نوسخەیان داوە بەوان، وە وتبویان فەرموو کوردەکان خۆیان بەدۆستی ئێوە ئەزانن، ئەوە



خەریکن عیراق پارچەپارچە ئەکەن و دەوڵەت بۆ کورد دروست دەکرێت و، خەتەر بۆ سەر هەر ٣ دەوڵەتەکە دروست دەبێت.

ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی سەفەرەکەی پاریس سەر نەگرێت و فەشەلی کرد.. بەڵام ئەگەر پارتی جددی بن خۆ بەبێ سەفەری پاریسیش ئەتوانرێت ئیمزا بکرێت،، ئەم ڕێککەوتننامەیە شتێکە قازانجی کوردی تێدایە. ئیتر لەپاریس ئیمزابکرێت، لەمزگەوتی گەورەی ئێرە ئیمزابکرێت، لەمزگەوتی گەورەی هەولێر ئیمزابکرێت، گرنگ ئەوەیە ئیمزابکرێت و دەست بکەن بەجێبەجێ کردنی، چونکە قازانجی گەلەکەمانی تیایە، قازانجی ئاشتی تیایە، قازانجی فەقیر و هەژاری تیایە.

پرسیار:
ئایا لە ئیتیفاقیەی پاریسدا باسی ئەوە کراوە کە هەردوو حزب ببن بەیەک حزب، شتی وا هەیە؟

** نەخێر شتی وا نەبووە.

پرسیار:
پارتی ئەگەر نیازی پاک نەبێت هیچ لەمەسەلەکان دەگۆڕێن؟.

** عیلاقاتی نێوان ئەحزاب وەکو عیلاقاتی ژن و پیاو و کورو

کچ نیە. لەعیلاقاتی ژن و پیاو و کوڕو کچ سیقە زۆر شتێکی زەروورییە. لەبەینی ئەحزاب و دەوڵەتەکاندا قانون تەحدیدی عیلاقەکە دەکات. ئێستا من حەز دەکەم بزانم مەرکەزی قانونی مام جەلال و کاک مەسعود چییە؟، تەداخل لە هەموو شتێکدا دەکەن. یەعنی بەچ سیفەتێک تەداخل لە هەموو شتێکی حکومەتدا دەکەن، لەنێشی پەرلەماندا دەکەن، لە عیلاقاتی خارجیدا دەکەن، لەمەسەلەی گومرکدا ئەیکەن.. یەعنی مەرکەزی قانونیان چییە؟، بەلام ئەگەر هاتنە ناو حکومەتەوە مەرکەزێکی قانونیان دەبێت، یەعنی ئەو دەسەلاتەی ئێستا لەدەرەوەی پەرلەمان و حکومەت بەکاری دێنن لەناو حکومەتەکەدا بەکاری دێنن. یەعنی دەسەلات دەگوێزنەوە بۆ ناو حکومەت، بۆ ناو پەرلەمانەکەو، ئەوساکە مەرکەزێکی قانونییان دەبێت، قانونیش تەحدیدی کردووە لەعیلاقەی نێوان رەئیسی پەرلەمان و رەئیسی حکومەتدا، لەبەینی وەزیرێک و وەزیرێکدا. بەلام ئێستا قانونێک نیە تەحدیدی عیلاقەی کردبێت لەبەینی یەکێتی و پارتیدا یا لەبەینی مام جەلال و مەسعوددا. لە ئیتفاقیەی پاریسدا نیابەتی کە هەبێتێکی رئاسی هەبێت کە پێک بێت لەسەرۆکی هەرێمی سولتەکە (سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی حکومەت، رەئیسی مەحکەمەی تەمیز)، بەلام جێبەجێ نەکراوە.

پرسیار؛
زەمان بۆ ئەو قسەیە چییە کە دەڵێن تا ساڵی ۲۰۰۰ شەڕ لەنێوان

-



یەکێتی و پارتیدا نابێت، ئایا ئەمە لە ئیتیفاقیەی پاریسدا هاتووە؟.

●● کۆمەڵێک شت کە بێت بەهۆی ئەوەی کە ئەو دوو حزبە پاشقول لەیەکتر نەگرن، موناوەرە لەیەکتر نەکەن، ئەگەر ئەو دوو تەرەفە ئەو زەوابتانەی ئیتیفاقیەکە ئیمزا بکەن، ئەوە گەورەترین زەمانە، کە پێمشم باش نیە لێرەدا باسی بکەم.

پرسیار؛
حەنابت چۆن ئایندەی عیلاقەی ی ن ک و پارتی دەبینن؟.

●● وەڵلا پێش سەفەری کاک مەسعود بۆ ئێران، زنجیرەیەک کۆبوونەوەی هەردوو مەکتەبی سیاسیمان کرد. لەوەدا گەلاڵەی رێککەوتننامەیەکی نوێ کە هی بلاوکردنەوە نیە، کە تەنزیمی عیلاقەی هەردوولامانە و ئەو زەوابتانەی کە ماموستا حەمەنوری پرسی ئونێنەری ک ن ا حوابم دایەوە وە وتم ئەو زەوابتانە ئەو زەمانەیە کە تا ساڵی ۲۰۰۰ شەڕ لەنێوان ی ن ک و پارتیدا نەبێت، لەوەدا باسکراوە، وە ئەگەر ئەوە جێبەجێ بکرێت، ئیمزا بکرێت. موهیم نوسینەکەی نیە.. موهیم جێبەجێ کردنەکەیەتی، چونکە پێش ئەم شەڕە ۵ یان ۷ ئیتیفاقمان مۆر کردووە، لەکاتی شەڕەکەشدا ۷ تا ۸ ئیتیفاق کراوە، بەلام موشکیلەکە ئەوەیە پارتی ئیحتیرامی ئیتیفاق ناگرێت، ئەم جارە

گەلاڵەی ئەم ئیتیفاقەی کە داڕاوەو ئیمزا نەکراوە کە پێش ئەوەی کاک مەسعود بڕوا بۆ تاران باسمان کردووەو ئەو ئیتیفاقەو ئیتیفاقی پاریس ئیمزابکرێت باشترین عیلاقە لەبەینی ی.ن.ک و پارتی دا دروست ئەبێت.

پرسیار:
ئەو مخالەفاتەی کە لەم دواییەدا ڕوویدا، وەکو ئەوەی ئاڵپارێز و ڕێگەی چەمچەماڵ،، یەکێتی چۆن قبوڵی دەکات؟.

** حێی داخە لەوە دەچێت لەناو پارتی دا ئیتیجاهێکی شەڕەنگێزی تیا هەبێت، من خۆم ناچێتە عەقلمەوە مەجموعەیەک خەڵکی لادێیەکی بچووک، ئەگەر کەسێک یا هێزێکیان لەپشت نەبێت بوێرن بچنە ڕێگەی کەس لەئەندام و کادری ئێمە، لەوانە ئەندامی سەرکردایەتی.. ئەوانە کە دەڵێن کاری فەردییە،، ناچێتە عەقلمەوە. ئێمە پەنا دەبەینە بەر قانون بۆ ئەوەی حەقمان بسێنێ. پەنا دەبەینە بەر پارتی کە ئەو جۆرە کەسانە داڵدە نەدات، ئەگەر نا خۆمان بەدەستی خۆمان حەقی خۆمان دەسێنین و بچنە هەر جێگایەکیش پەلاماری ئەو جێگایە دەدەین و بەتەریقەی خۆمان محاسەبەیان دەکەین، لەمەودواش چاوپۆشی لەهیچ تەعەدایەک ناکەین، جارێکی تر لەهیچ تەعەدایەک، لە کوشتنی خەڵکی بێتاوان چاوپۆشی ناکەین، وەکو دەزانن لەئاوپارێز و لەقوڵەی کانی ماران لەژێر چادری ئەوان



خۆیان شاردووەتەوە، لەسلێمانی لەسەر خانوو حەرەمێکیان کوشت و چاوپۆشیمان کرد، لەنزیک چەمچەماڵ ٨ کەسیان کوشتین، خوا نەیکوشتن و لەمەرگ گەڕانەوە.. ئێمە لە لیجنەی تەنبیع باسمان کردووە، لەلیجنەی مشتەرەک باسمان کردووە، ئەگەر لەمەولا فایدەی نەبوو خۆمان ئیجرائات دەکەین... خۆ ئێمە ئەوەندە بێدەسەلات نیین کە تەعەدا لەخەڵک قبوڵ بکەین.

پرسیار:
ئایا هاتنی ئەم دواییەی وەفدێکی حکومەتی ئێران خۆی لەخۆی دا ئیعتیراف نیە بەحکومەتی کوردستان؟.

** لەڕاستی دا خۆی کورد لەگەڵ ئێران دا عیلاقەی سارد کردبووەوە، کە ئەیتوانی هەر بەگەرم و گوڕی بیهێڵێتەوە، هەر لەدوای ڕاپەڕینەوە تا ئێستا ئەو عیلاقانە بەزیندویی بهێڵێتەوە.
هاتنی وەفدی وا لەڕاستی دا من نەمبینیون، وەفدەکەش وەفدی سێ محافەزەکەی کە هاوسنوورن لەگەڵ کوردستان دا،، هاتوون بۆ ئەوەی کە عیلاقاتی تەبیعی دروست بکەن.. ئێمە حکومەتی ڕەسمی نیین تاکو داوا لەدەوڵەتان بکەین ئیعترافمان پێ بکەن، ئێمە جوزئێکین لەدەوڵەتی عیراق، داوامان لەکەس نەکردووە بڵێین وەرە ئیعترافمان پێبکە بۆ ئەوەی دەوڵەتێ سەربەخۆ بیین، ئیعلانی ئیستقلالمان نەکردووە، بەتەماش نیین ئیعلانی ئیستقلال بکەین، ئێمە دەوڵەتی

سەربەخۆ نیین، ئێمە وەکو ئەمری واقع لەپارچەیەکی عیراقدا حکومەتێکمان بۆ خۆمان دروست کردووە، لەرووی قانونی دەولی یەوە، لەرووی سیاسی یەوە، لەرووی جوگرافی یەوە هەتاکو ئێستا ئێمە جوزئێکین لەدەوڵەتی عیراق، بەلاّم دەوڵەتە مەرکەزی یەکەمان دەوڵەتێکی خراپە. پێشتریش کە ئەم حزبانەی کە حکومەتێکیان لەبەر ئەمری واقع دروست کردووە، لەگەڵ ئێران هاوپەیمان بوون، هاوکاری یان کردووە،، فەترەیەک ساردی کەوتە بەینی ئەم دوولایەنەوە، ئێستا زیندوو بووەتەوەو من ئومێدم وایە رۆژ بۆ پێشەوە بچێت و وەکو دوو برا بتوانن لەمەحالاتی جیاجیا تەعاون بکەن و ئیش بکەن، ئەگینا وەکو ئەوەی ئیعتیراف ییت ئیعتیراف نیە، ئەگینا وەحتی خۆی ئەمەریکایی یەکان چوونە پەرلەمان و ئینگلیز چوونە پەرلەمان و فەرەنسی هات و چوون بۆ پەرلەمان و دانیشتن و لەگەڵ رەئیسی حکومەت دانیشتن و وەکو شتێکی ئەمری واقع معامەلەی لەگەڵدا دەکەن. بەلاّم وەکو ئەوی ئیعتیرافێکی دەولی یە، ئێمە خۆمان داوامان لێ نەکردوون.

پرسیار:
مەسەلەی گومرک و داهاتی گومرک، ئاگادارن کە مودیری بانق خەڵک ئیزن دەدات کە پارە نیەو بانقەکە بەرەو ئیفلاسی دەڕوات، ئێمە وەکو راگەیاندن داوای قسەکردمان لێ کردوون، ئەوان بەکیتابی وەزارەتی داخلی یەوە، دەڵێن هیچ جۆرە قسەیەک ناکەین بۆ ئەجهیزەی ئیعلام...



وە ناردنی داهاتی برایم خەلیل و گومرکەکەی چی یە لەلایەن پارتی یەوە..؟ مبرریان چی یە؟.

** پارتی هیچ مبرریکیان نیە. ٦ مانگە واریداتی گومرکی بادینانیان زەوت کردووەو بە زۆر بردویەتی. ئەوەی مەنتیقەی سلێمانی وەفدێکی پەرلەمان هاتن، چوون سەریان لەبانقدا بینیان وارداتی گومرکی سلێمانی دەچێتە بانقەوە، تەنانەت ئەوەی زەمانی شەڕیش چووەتە بانقەوەو یەکێتی لەبانق دەری هێناوە چونکە بانق دەزانێ چەندە... لەبادینان وایان نەکردووە، پارتی قسمێکی هەڵگرتووە بۆ خۆی.. وارداتی گومرکی برایم خەلیل رۆژانە ٦ تا ٨ ملیۆن دینارە، حەز دەکەم بەدڵنیایی یەوە پێتان بڵێم، ئەگەر ئەو گومرکە بەدەست ئێمەوە بێت ئەتوانین هەزار کاری چاکی پێ بکەین، ئەتوانین مەعاشی موەزەف زیاد بکەین، مەعاشی تەقاعد بدەین، چەند پرۆژەی پێ بکەینەوە، داوودەرمان بۆ خەستەخانە بکرین، فەقیروهەژار مەعاشی بدەینێ، چەندین شوقەی سەکەنی دروست بکەین.. بەلاّم پارتی نایەوێ ئەوە بکرێت، بەتایبەتی خەڵکی مەنتیقەی سۆرانی بەلاوە گرنگ نیە، میللەتەکە بەمیللەتی خۆی نازانێ. لەبەر ئەوە برسی ئەبێ تینوی ئەبێ، عیراق دێتەوە داگیری ئەکا،، بەخەیاڵیا نایە، ئەو قورگی کوردستانی عیراقی گرتووە کە بریتی یە لەگومرکەکەی برایم خەلیل، مەعاشی موەزەفەکانی خۆی زیاد کردووە، هەرچەندە هیچ خزمەتێکیشلی نەکردوون. ئەیتوانی مەسەلەن وەکو یەکێتی لەکاتی

شەڕدا کارەبای دەربەندیخانی ڕاکێشا، نەیتوانی کارەبا بۆ دهۆک ڕابکێشێ، یا نەیتوانی چەند موەلیدەیەکی گەورەیان بۆ بکڕن تا لەتاریکایی ڕزگاریان بکەن.. ئەو موشکیلەیە موشکیلەیەکی گەورەیە، هیچ مبرڕێکیان نیە جگە لەوەی کە بەزۆرەملێ داگیریان کردووە، ئەگینا هیچ مبرڕێکی قانونی یان نیە کە ١ فلسی گومرکی برایم خەلیل بخۆن. بۆ مەعلوماتیش لەناوچەی سلێمانی دوو نوقتەی گومرکیان داناوە، لەناوپارێزو لەشوێنێکی تری لای هەڵەبجەش گومرک وەردەگرن.

پرسیار:
کاک ئەوشیروان لەهەولێریش وا باوە کە ی ن ک گومرکی سلێمانی نادا بە حکومەتی هەرێم.

•• وا من لێرە لەبەردەمی تەلەفزیۆندا دەیڵێم، لەهەولێرەوە هەرکەسێک دەنێرن بابێت لە بانقی هەرێمەوە، لە پەرلەمانەوە دەبنێرن، بابێت سەیری حیسابی بانقی ئێرە بکەن.. ئەگەر ئێمە وەکو یەکێنی یەک فلس و عانەو ماقرێکمان لەگومرک گل دابووەوە و هەمووی نەچووبووە خەزێنەی حکومەتی هەرێمەوە چی بەئێمە دەڵێن بیڵێن. بەڵام واریداتی ئێمە کەمە، بەتایبەتی لەدوای ئاشت بوونەوە ئێمە گومرکەکانی خۆمان نەنەدا لەسەر حگەرەو شت کە ئەچوو بۆ ئێران، چونکە لەبرایم خەلیل لێی وەردەگرن. لەکاتی شەڕەکەدا



ئەوان لە برایم خەلیل لێیان وەردەگرتن ئێمەش لێرە گومرکمان لێ وەردەگرتن.. بەڵام پاش ئەوەی ڕێک کەوتین ئەو گومرکانەمان لابردووەو ئەو سەیتەرانەی دانرابوون بەشکلی عەبر قانونی هەموبانمان لابردوون.. ئێستا هەرچی هەیە دەچێتە خەزێنەی بانقی حکومەتەوە.

لەوەڵامی پرسیارێکی تردا:

•• ئەگەر سوء تەسەروف نەبوایە ئەمانتوانی ئەو پارە قەرزانەی کە هاووڵاتیان هەیانە لەبانقەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم، هەمووی ١٥٠ ملیۆن دینارە، یەعنی ئەمانتوانی زۆر بەئاسانی ئەوانیش بدەینەوەو شان بەشانی ئەوەش باری شانی موەزەف چاک بکەین، ئەو ئەقاعیدانەی کە ئەچن بۆ کەرکوک و مەخمور، ئەوانە هەزار بیانەیان دەکەن تا پارەیەکی قەڵبیان ئەدەنێ، ئەمانتوانی مەعاشی ئەوانیش بدەین، مەشاریعی تەنمەوی بکەینەوە. ئەمانتوانی پارەبدەین بەبانقی زراعی یارمەتی فەلاح بدات، ئەمانتوانی پارە بدەین بەبانقی عەقاری یارمەتی خەڵک بدات خانوو دروست بکات، ئەمانتوانی هەموو ئەو شتانە بکەین.

پرسیار:
ئایا حەل بۆ ئەوە چی یە، دوای ئاشت بوونەوە ٥ ملیۆن دیناریان ناردووە، دوو ملیۆنیان دیناری ئاسنە؟.

●● ئەو ٥ ملیۆن دینارە کە بەو شێوەیە ناردوویانە، وەکو ئەتکەو تیهانە وایە، من نامەوێ لێرەدا حەلەکەی بڵێم، ئەبێ دانیشین بیر لەوە بکەینەوە، حەلێکی بۆ بدۆزینەوە یا وەکو ئەوەی دەڵێن (الکل حادث حدیث)، من خۆم لەو خاوەن دەسەڵاتە نازانم لەخۆمەوە حەلی بۆ دابنێم، هەتا ئێستا لە گفتوگۆداین بۆ ئەوەی کە ئیقناعیان بکەین کە بینێرن.

پرسیار:
ئێمە وەکو ڕاگەیاندن دایمە ئامۆژگاری دەکرێین کە لەئاشتی وەزعی تەبیعی دا بین، بەڵام برادەرانی پارتی و بەتایبەتی گوڵان دایمە لە وروژاندن و لەحزمەتی تێکدانی وەزعدایە، تۆ دەڵێی چی؟ ئایا تا کەی بێ دەنگ بین.

●● کاکە حۆی ئەوە تەوجیهی مەکتەبی سیاسی یە کە بەوپەڕی توانا هەوڵ بدەین بۆ ئاسایی کردنەوەی وەزع، من ڕای شەخسی خۆم ئەوەیە کە یەکێتی لەهیچ شتێک بێدەنگ نەبێت.. بەنسلوبی ئیستفزازی نا، بەئسلوبی ئانەو ئەشەڕ نا، یەعنی بەئسلوبی وا نا کە فیتنە هەڵبگیرسێنێت، بەڵام لایەنگری ئەوەم کە هەموو حەقیقەتێک بەخەڵک بووترێ، زۆرجار ونووسەو ئێستەش دەیڵێمەوە کە ڕۆژانە چەندان حەقایق هەیە بەناوی مەسلەحەتی گشتی بەوە لەمبللەتەکەی



دەشارنەوە کە دەبێ باس بکرێت، یەعنی خەڵکی نایبیستێ، نایزانێ،، کە شتێک دێتە پێشەوە خەڵک چەواشە دەبێت، من لایەنگری ئەوەم کە هەموو ئەو حادیسانە یا خروقات، یا حەرقی قانون، خەرقی تەتبیع، مخالەفات، تاوان، جەریمە، ئەمانە کە دەکرێت لەبەرچاوی خەڵک بووترێت، لەڕادیۆو تەلەفیزیۆن، لەجەریدەکەی خۆمانا بووترێت، بڵاوبکرێتەوە، لەخەڵکەکەی خۆمانی نەشارینەوە.. چونکە ئێمە هێزی عەشیرەتمان نیە، هێزی میللەتمان هەیەو هێزی میللەتیش دەبێ مواجەهەی بکەی بەحەقایق و بەڕاستی ڕووداوەکانی بخەیتە بەرچاو، ئەگەر وەکو جاری پێشوو شتی لێ بشارینەوە، ئەراکم دەکات، لەپڕێکا دەتەقێتەوە، دیسانەوە شەڕ هەڵدەگیرسێتەوە، لەباری سەرنجی منەوە ئەوە سیاسەتێکی غەڵەتە.

پرسیار:
تیشکێکی خەتەرناک لەم ڕۆژانەدا هەڵکرا، کە ئیتر حەستەخانە دەرمانی نەماوەو لەوانەیە دابخرێت، بۆ ئەوەی خەڵک نەکەوێتە ئەو میحنەتەوە، بۆ چەند ڕۆژێک هەوڵ بدەن داوو دەرمان تەرخان بکرێت، تا حەستەخانەکان دانەخرێن.

●● من خۆم چەند دکتۆرێکم بینیوە لەلای خۆمەوە هەوڵ دەدەم لەگەڵ ئەو کەسانەی ئەو ئیمضامەیان بەدەستە یان هەندێ پارە دابین بکەین، بەڵام ئەوە بەئێمە ناکرێ تا سەرێت.. من وەکو ووتم ئەو

برادەرانە ئەم وڵاتە بەوڵاتی خۆیان نازانن، تەنانەت لەدابەش کردنی دەرمانا وادانراوە ٢٥٪ بۆ دهۆک ٢٥٪ بۆ هەولێر ٢٥٪ بۆ سلێمانی ٢٥٪ بۆ کەرکوک، خۆشتان ئەزانن دهۆک بەهەمووی بەقەدەر نۆرەدوگایەک لەنۆرەدوگاکانی سلێمانی نابێت، بەعنی شارێکی بچکۆلانەیە، بەهەموو نفوسیان ٥٠٠ هەزار تێ‌نایەڕێت، مع العلم لەشارێکی وەکو سلێمانیدا بەتەنیا لەناو شارەکەدا ٦٠٠ هەزار کەسی تیایە، بێ‌عەدالەتی هەتا لەداودەرمانیش کراوە.. مەفروزە وەزارەتی تەندروستی کارێکی وابکات بەگوێرەی نیسبەتی دانیشتوان دەرمان دابەش بکات نەک وەکو ئەوەی ٤ برا. چونکە ئەمە ناعەدالەتی تیایە، چونکە نفوسی هەولێر لەدهۆک زۆرترە، نفوسی سلێمانی ٦٠٠ هەزار کەس دەبێت ئەگەر زیاتر نەبێت، بەو حیسابەی کە سلێمانی ملیۆنێک و ٦٠٠ هەزار کەسە ٥٠٪ ی دەگرێتەوە، ئەبێ ئەم بێ عەدالەتی‌یە لەوەزارەتی تەندروستی‌یەوە ڕاست بکرێتەوە.. وە بۆ شتی وەتی هەوڵێک دەدەین بەسەرچاو.

پرسیار:
ئایا وەزعی نالەبار چۆن دەچێتە سەر ؟

●● ئەم وەزعە نالەبارە باشترە لەشەڕ، چەند وەزع لەمە خراپتربێت هەر لەوەزعی شەڕ باشترەو لەوە باشترە کە یەکتری بکوژین وە هەردەبێ بەزمانی گفتوگۆو لەیەکترگەیشتن. من نازانم ئەو رەحمەی



لەسلێمانی ڕۆشنبیرەکان و خەڵک و ئەهلی ناوبازار لەسەر ئێمەیان هەیە، چی مەسەلەیەک هەبێت دێن یەخەمان دەگرن و پێمان دەکەن. با خەڵکی هەولێرو دهۆکیش وابکەن، ڕۆشنبیرەکانی ئەوێش بجوڵێن، ئەهلی بازار بجوڵێن، رەئیس عەشیرەتەکان بجوڵێن، مامۆستای جامعە بجوڵێن، زەختیان لێ بکەن، با ئەوانیش بێنە پێشەوە، با حکومەتێکی بەدەسەلات و ڕێکوپێک دروست بکەین، ئەوە تەنیا بەسلێمانی ناکرێت، سلێمانی کەوتوەتە کەناری کوردستان، دهۆکیش کەوتوەتە کەنارەوە، ئێمە ئەگەر زەخت بۆ سەر ئەم حزب و ئەو حزب بێنین تەئسیرێکی ئەوتۆمان نیە.. ئەوەی کە هەیەتی هەولێرە عاملی حەسیم بێت، مەفروزمە هەولێر ئەو دەورە ببینێت، زەخت لەقیادەی پارتی بکات، لەقیادەی یەکێتی بکات، بۆ ئەوەی ئەو وەزعە باش بکەن، بۆ پێشەوە بڕوات، حکومەتێکی ڕێکوپێک دروست بکەن کە قانون بچەسپێنێت.. ئەوە تەنیا بەئێمە ناکرێت،، بەدەرەجەی ئەساسی بەهەولێری‌یەکان دەکرێت.

پرسیار:
ماوەیەک زاهیرەی چەکداری لەناو شاری هەولێردا کەم بووەوە، ئێستا وەکو خۆی لێ‌هاتوەتەوە، ئایا چی بکرێت باشە بۆ ئەوەی ئەو دیاردەیە نەمێنێت ؟

●● ئەو بڕیارانەی محافزی هەولێر، وەزیری ناوخۆ دەریان کردووە

جێبەجێ بکرێن شتێکی باشە، ئەگەر جێبەجێ بکرێن.... ئەوەش مرشکیلەی خەڵکی هەولێرە.. ئەو قانونەی پەرلەمان دەری کرد بۆ هەڵگرتنی چەک، جێبەجێ بکرێت شتێکی چاکە.

پرسیار؛
مەسەلەی کورد لەدوورییانێکدایە، ئایا ئەو مەسەلەیە خەتای کوردە یا غەرب، چونکە غەربیش تائێستا هەنگاوێکی عەمەلی نەناوە بۆ مەسەلەی کورد.

●● من پێم وایە بەدەرەجەی ئەساسی کورد خۆیەتی، بۆ ئەوەش تۆ دەڵێی غەرب هیچ هەنگاوێکی نەناوە، من موافق نیم.. ئەم شارەی کە ئێستا بەزەبری چەکەی ئینگلیز خراوەتە سەر عیراق، بەهەمان شێوە کە ئێستا ئێمە لێرە دانیشتوین ئەوان پشێوانیمان لێدەکەن، یەعنی دنیاکە ئەوەندە گۆڕاوە.. پیاوەکۆنەکانی سلێمانی لەبیریانە وەختی خۆی ئینگلیز هات ئێرەی داگیرکردو کردی بەجۆرێک لەخاکی عیراق،، ئێستا حاڵی حازر یەکێک لەوانەی ئێمە دەپارێزێ بۆ ئەوەی عیراق نەتوانێ داگیرمان بکات ئینگلیزە . لەکاتی ئاشبەتاڵ دا ئەمریکا پشتی لەکورد کرد، ئێستا ئەوەی کە حەریصە لەوەی کە کورد بپارێزێ ئەمریکایە.. یەعنی زروفی دەولی زۆر زۆر گۆڕاوە، زروفی ئەقلیمیشمان گۆڕاوە. ئێمە لەکاتێکدا کە معاهەدەی سەعد ئاباد ئەبەسترا، معاهەدەی بەعدا ئەبەسترا، کەچی ئێستا حاڵی حازر



عیلاقەمان لەگەڵ دراوسێکانمان هەیە، تجارەتمان هەیە، ئێمە ئەوان دەعوەت دەکەین، یەعنی ئێمە ئوقسانیەکە لەخۆمانە، یەعنی ئێمە حکومەتێکی ڕێکوپێکمان دروست کردووە تا بڵێین غەرب نایەتە پێشەوە؟.

پرسیار؛
لەم ماوەیەدا ٥ ملیۆن دینار پارتی ناردویەتی وەکو مبادەرەی خێر...

●● ئەخێر وتمان ئەوە وەکو ئیهانەیە ناردویانەو مبادەرەی خێر نیە، گاڵتە پێ کردنە.. من وەکو بیستومە لەمەسئولە گەورەکانی پارتی لەیەکێ لەدانیشتنەکانی خۆیدا وتوویەتی. لەدانیشتوانی کۆبونەوەکەی پرسیوە، ئایا ئێمە گومرکی برایم خەلیلمان بەدەستەوە بێت و ڕۆژی ٧ ملیۆن دینارمان دەستکەوێت باشترە یا بڕۆین سلێمانیمان بەدەستەوە بێت کە ڕۆژی ٢ ملیۆن دیناری تیا سەرف بکەین؟. بەهانەکانیان هیچی بەهانەیەکی قانونی نیە، سیاسی نیە.

لەوەڵامی پرسیارێکدا؛

●● وەڵڵا کاکە ئێستا زروفەکە گۆڕاوە، ئەو ٧٪ ـە هی مەجموعەیەک حزب بوون، ئەو حزبانە هەندێکیان ئیئتیحاقیان بەم لاوە کرد، هەندێکیان ئیئتیحاقیان بەولاوە کرد.. هەندێ بڵاوەی کردوە، من

خۆم شەخسی ناتوانم پێشبینی ئەوە بکەم کە هەڵبژاردنی داهاتوو کێ ٧٠٪ ئەهێنێ کێ کەمتر ئەهێنێ کێ زۆرتر ئەهێنێ، وە ئینتیخاباتیش تا ئیحسایەکی ورد نەکرێ ئینتیخابات ناکرێ. هەردوولا یەکێتی و پارتی ڕێککەوتوون کە ئیحسایەکی ڕێکوپێک بکرێت بۆ ئەوەی بزانن نفوسی کوردستان چەندەو ئەوانەی حەقی دەنگدانیان هەیە چەندن، پاش تەواو بوونی عەمەلیەی ئیحساکە. عەمەلیەیەکی مەعقەدە بەڵام قابیلی کردنە، بۆ مەسەلەی دائیری و نسبی، من شەخسی خۆم وەختی خۆی لایەنگری ئەوە بووم کە دائیری بێت بێ هیچ مەرجێک، بەڵام ئێستا ئەبێ لێکبدرێتەوە کە بزانن تەجروبەی ٣ ساڵی ڕابردوومان چۆن بووە، بۆ ئەوەی کە لەبەر ڕۆشنی تەجروبەی ڕابوردومان دا بیر لەوە بکەینەوە کە ئەم جارە نسبی بێ یا دائیری بێ، چۆن بێت و چۆن نەبێت.

پرسیار:

دەربارەی خراپی وەزعی سجنی سلێمان و باری خراپی بەندیخانەکان بەگشتی و فراوان کردنی سجنی سلێمانی، ئەگەریش بەکرێت شتی زۆر خراپ ڕوو دەدات، معالجەی جەنابتان چیە؟

●● من بەداخەوە ڕەنگە لەئێوە ئاگادارترم لەوەی کە وەزعی بەندیخانە چۆنە لەوەی وەزعی مەحاکم چۆنە، وەزعی شورتە چۆنە. یەعنی زۆر جێگای داخە لەحەرسێکیان دا بەڕاستی حقوقی بەشەر بەشکلێکی فەزیع پێشێل دەکرێت.. دەبێت ئیسلاحی جیهازی قەزایی



بکرێت، باش بکرێت، ڕێکوپێک بکرێت، بۆ ئەوەی قەزایەکی عادل بێت. دیسانەوە جیهازی شورتە ئەبێت چاک بکرێت.. ئێمە ئیقتراحمان کردووە لەگەڵ سەرۆکی پەرلەمان کە جارێکیان هات بۆ.. قەڵاکەی ......، میقدارێک پارەی بۆ تەرخان بکەن و بیکەن بەسجنێکی عەسری، ئاوەدانی بکەنەوە، تەعمیری بکەنەوە، دەورپشتەکەی بکرێت بەباخ و زەرعات، بۆ ئەوەی ئیعادەی تەربیەی سجنەکان بکرێتەوە، ئیدارەیەکی ڕێکوپێک بۆ سجنەکان دابنرێت، بالمناسبە لەگەڵ پارتی ڕێک کەوتووین ئەگەر پەشیمان نەبنەوە لەتەعدیلی وەزاری داهاتوودا وەزارەتێک بەناوی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی یەوە دابمەزرێت، ئەم وەزارەتە جگە لەدایرەی عەمەل و ضمانی ئیجتماعی، دائرەی تەقاعد و مونەسەسەیەکی تازە بۆ شەهید دروست دەکرێت، لەهەمان کات دا بەڕێوەبەری سجنەکان بەرەو ڕووی ئەم وەزارەتە دەکرێتەوە، بۆ ئەوەی بەشکلێکی عەسری لەگەڵ کوردستانێکی ئازاد دا بگونجێت، سجنێکی ئاوا دروست بکرێت، من ئومێدم وایە ئەو قەڵایە تەواو بێت و شتێکی باشی بۆ دروست بکرێت و ئەبێت مواسەفاتی ئینسانی تێدابێت، بەو شکلە چارەسەر دەکرێت.

پرسیار:

پاش چاک بوون و لێک نزیک بوونەوەی پارتی و یەکێتی، ناوی بەرەی کوردستانی تۆزێک لەبیر چووەوە، ئایا جەنابت چۆن تەفسیری بەرەی کوردستانی دەکەیت؟.

●● بەرەی کوردستانی هەر ماوەو حەل نەبووە، بەلام نەشاتی کەم بووەتەوە، نفوزی کەم بووەتەوە، دەسەلاتی کەم بووەتەوە. هەندێ را هەبوو کەوا بەرە زیندوو بکەنەوە، بیکەنە بەدیلی حکومەتی کوردستان کەخۆتان دەزانن لەسایەی بەرەی کوردستاندا ولاتەکەمان وێران بوو، بەلام ئێستا گفتوگۆ هەیە لەبەینی هەموو حیزبەکاندا بۆ ئەوەی بەرنامەی بەرەی کوردستانی ئالوگۆڕ بکرێت، دەستکاری بکرێت، کە بگونجێت لەگەڵ داهاتوودا، چونکە بەرنامەکەی کۆنە.
دووهەمینی بۆ ئەوەی ئیش وکارەکانی بۆ دیاری بکرێت کە چی بکات و واجبەکانی چی یە، چونکە لەهیچ حالەتێکدا نابن بە بەدیل بۆ پەرلەمان و حکومەت، بەلام ببن بەسیفەیەک کە ئەوانیش مینبەرێک بن، شوێنێکەیەک بن تەنسیقی سیاسی لەبەینی حزبەکاندا بکرێت. حالی حازر خەریکی گفتوگۆن بۆ ئەو مەسەلەیە، بۆ زیندوکردنەوە و گۆڕینی بەرنامەکەی لەم تەعدیلەی کە ئەکرێت، جگە لە یەکێتی و پارتی ئەو حزبانەش بەنەزەری ئیعتیبار وەردەگیرێن و جێگایان دەدرێتێ.

پرسیار:
دەربارەی سەنگەر گواستنەوە.

●● لەراستیا ئەم مەسەلەیە یەکێک بوو لەو زەوابتانەی کە تا



ساڵی ٢٠٠٠ دەبێ بێ.. لەم مەسەلەی سەنگەر گواستنەوەبەدا یەکێک لای ئەوان مخالەفە ئەکات دێتە لای ئێمە، لای ئێمە مخالەفە ئەکات ئەچێتە لای ئەوان، ئیستفزازی هەردوولامان دەکەن بەپارە بەچەک بەفلان.. بۆ موعالەجەکردنی ئەو مەوزوعە لەکۆبوونەوەی پێش سەفەری تارانی کاک مەسعود، ئێمە ئیقتیراحمان کرد کە ئیتیفاقێک هەبێت کە بۆ ماوەی ساڵێک نە ئێمە کەسی پارتی وەربگرین و نە پارتی کەسی یەکێتی وەربگرێت، بۆ ئەوەی کۆتایی بەو هێنە بهێنین.. خەڵک لەیەکتر هەڵگێڕانەوە.. ئەو زەمانە ئەوان وایان ئەزانی خەڵک زۆر ئیلتیجاقیان پێوە ئەکات، چونکە هێشتا مەفارزیان نەگەڕابووەوە.. لەئاخیرا دەوکەوت. کە ئەوانیش گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە،، ئێمەش وتمان باشە حازرین.

پرسیار:
تەتبیع لەهەولێر چۆن هەڵدەسەنگێنن؟.

●● بەراستی من زۆر لەهەولێر نەژیاوم، یەک جار لەهەولێریش پیاسەیەکم کردووە، پێم وایە هەولێر وەزعەکەی ناتەبیعی یە، هەرچەندە هەولێر شەری تیا نەبووە، هیچ مەڕێکی تیا داگیر نەکراوە عەیری ئەوەی کە وەختی خۆی هی بزوتنەوەی ئیسلامی.. پێم وایە هەولێر وەزعێکی زۆر ناتەبیعی یە، مەسەلەن من جاری وا هەیە خۆم لە سلێمانی دەکەرێم بێ حیمایە دەسوڕێمەوە، کەدێم بۆ هەولێر ناوێرم

بێ جیمایەبم، هەر ناوێرم بچم بۆ گەڕان.. ئێوە لێرە چ جێگایەک بەخەتەری ئەزانن من لەگەڵ یەک زەلاما ئەچم بۆ ئەوێ شعور بەخەتەریەت ناکەم، چونکە وائەزانم لەناو میللەتەکەمدام، ئەوان دەمپارێزن.. بەڵام لەهەولێر ئەوەندە چەکداری ئەناسراوو ئەوەندە چەکداری ئەموەنەوو مقەری جیاجیاو عەجیبو غەریبی تیایەو ئۆتۆمبیلی مسەلەح فرکو هۆڕ دەکات کەس ناوێرێت بگەڕێت. وەکو دەسەلاتی سیاسی ئێمە مەسئول نین، خەتای خەڵکی هەولێر خۆیەتی، لە ئینتیخاباتدا دەنگیان بۆ پارتی ئەدایە دەنگیان بەیەکێتی بدایە وەکو چۆن لەسلێمانی محافزێکی باشمان بۆ داناون، محافزێکی باشمان بۆ دائەنان کە شارەکەی ڕابگرتایە.. تازە بۆ ئینتیخاباتی داهاتوو.

وەلامی پرسیارێک:

●● خێلایەتی لەو ئەوعە حزبانە لەناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هەیە، ئەوە حزبی بنەماڵەیە.. لەهندستان هەیە، لەپاکستان هەیە، لەئەفغانستان هەیە، لەلوبنانیش هەیە خۆی لەڕاستی دا عەشایەر لەکوردستاندا واقعە، من پێم خۆش نیە عەشیرەت هەبێت، کە بووش ئەبێ معامەلەی لەگەڵدا بکەین، ئەبێ هەوڵ بدەین بەئیتیجاهی باش ببەین، ئەبێ هەوڵ بدەین ئەو تەقالیدە جوامێریانەی لەناو عەشیرەتدا هەسووە پارێزگاری بکەین، بەقوەتی بکەین، ئەبێ وابکەین ئەم عەشیرەتانە تەبابن، ئەچن بەگژ یەکتریا، دۆستی یەکتربن. ئێمە



لەدوای موتەمەری یەکێتی نیشتیمانی یەوە کە ئەفکاری خۆی گۆڕیوە، ئێمە جاران پێمان وابوو صیراعی چینایەتی مورحەرکی تاریخی بەشەری یە.. ئێمە ئەوەمان گۆڕیوە، ئێمە ئێستا ئیمانمان بەسلمی تەبەقی هەیە، باوەڕمان بەوەیە دەوڵەمەندو فەقیر پێکەوە بژین، عەدالەتی ئیجتیماعی تەحقیق بکەین... تا ئێستا لەناو ئێمەدا هێشتا هەن بەعەقلیەتی صیراعی تەبەقی ئیش دەکەن، ئێمە لەمەرحەلەیەکداین پێویستیمان بەهەموو جۆرە ئیستیقرارێک هەیە... ئیستقراری سیاسی، ئیستیقراری ئیجتیماعی، ئیستیقراری ئیقتیسادی.. هەتا پێویستمان بەئیستیقراری نەفسی میللەتەکەمان هەیە، تاکو ئەم مەرحەلەیە بکەین بەمەرحەلەی پێناو بۆ پێشەوە بچین، ئێستا کاتی ئەوە نیە ئێمە عەشیرەت بکەین بەگژی عەشیرەتدا، ئاغا بکەین بەگژ جوتیارا، لەکاتێکدا هەموو وەک یەک لێ ی قەوماوە، هەموو وەکو یەک فەقیر بووە، دوای ئەوە بونیەی عەشیرەت عیلاقەی بەخوێنەوە هەیە، بۆیە لەگەڵیان معامەلە ئەکەین، شتە باشەکانیان چاک ئەکەین، بەتایبەتی تەقالیدی جوامێری، نانبدەیی و میوانداری و ڕاستگۆیی و ئەم جۆرە شتانە.

پرسیارێکی تر لەبارەی ئەرزو ڕەئیس عەشیرەتو جوتیار:

●● کاکە خۆی ئێستا قانون هەیە، قانونەکان تەنزیمی عیلاقەکەی کردووە. لەبەینی ئەواندا زۆری ڕەئیس عەشیرەتەکان کە وەختی خۆی

قانونی ژمارە ٩٠ دەرچوو، مولکێکی کەمیان ماوە، بەعزێ لە رەئیسی عەشیرەتەکان ئەسڵەن مولکیان نیە، بەڵام نفوزی هەیە لەناو تایەفەکەی خۆی دا، لەناویاندا ماوەتەوە، سولحی بۆ کردوون، لەشایی و شیوەندا لەگەڵیاندا بووە..

حەوی ئەمانی بەعس تەشجیعی ئەوەی کردووە، یەعنی وەختی خۆی کە ئەم ئەفواجی دیفاع وەتەنی یانەیان کە دروست کرد لەسەر ئەساسی عەشیرەت دروستیان ئەکرد، ئەی خۆ ئێمە زیندومان نەکردۆتەوە، ئەمە واقیعێک بووە هەبووە.. لەزەمانێکدا بەرە و رەعیفی و لاوازی رۆیشت، کە بەعس هاتەوە سەرکار زیندوی کردەوە.. قوناغی ئەوە نیە کە عەشایر هەڵوەشێنیت، ئەمە قوناغی ئەوەیە کە لەگەڵیان بڕین، رایان بکێشین بۆ کوردایەتی، بۆ نیشتیمانپەروەری، بۆ نیشی باش.

پرسیارێک دەربارەی یەکێتی و پارتی؟

** وەڵلا بەیەکگرتنی یەکێتی و پارتی هەموو کێشەکان حەل نابێت، رەنگە هەندێکی حەل ببێت، بەڵام هەموی نا، چونکە ئێمە بەشێکین لەعیراق، حەساری دەولیمان لەسەرە، حەساری دەوڵەتانی دراوسێمان لەسەرە، بەعزە جارێ حەساری سروشتیشمان لەسەرە.. بەفروباران دەبارێ. لەبەر ئەوەی دەرامەتێکی ئیقتیسادی واشمان نیە کە بتوانین شتێکی وا بکەین.. من پێم وایە نە یەکێتی ئامادەیە لەگەڵ پارتیا یەک بگرێت، نە پارتی ئامادەیە لەگەڵ یەکێتیا یەک



بگرێت، چونکە دوو سیستەمی جیاوازن.

*** ئامادەبوان وتیان، بەڵێ لەرۆژنامەی خەبات دا هەردوو نوسەر فلک الدین کاکەیی و دکتۆر رۆژ نوری شاوەیس شتێکی وایان نوسیوە.

** بەشێوەیەکی رەسمی شتی وا باس نەکراوە، بەڵام بەشێوەی لابەلا باسکراوە و بەشێوەی غەیر رەسمی بووە، چونکە ئێمە یەکێتی و پارتی جگە لەوەی کە لە ئەفکار و تەوەجوهاتی ئیجتیماعی و سیاسی و ئیقتیسادیمانا دوو نۆعی جیاوازین، لەشێوەی سەرکردایەتی کردنیشا دوو نۆعی جیاوازین. سیستەمی ئێمە جیاوازە لەهی پارتی. لەم جۆرە حزبانە لەدنیاشدا هەن. یەعنی سەرکردایەتی پارتی دەبێت لەبنەماڵەی بارزانی بێت، بەڵام سەرکردایەتی ی.ن.ک لەناو یەکێتی دا بەزەرورەت ئەوە نیە کە دەبێ تاڵەبانی بێت.. مام جەلال بەکەفائەتی خۆی بووە بە سکرتێری ی.ن.ک نەک لەبەر ئەوەی کە کوری شێخ حسام الدینی تاڵەبانی یە. بەڵام لەناو پارتیا وەزعەکە مەوعێکی ترە.. لەبەر ئەوە ئەم دوو حزبە تەحالفی نزیکیان هەبێت، ، ئەو دوو جۆرە سەرۆکایەتی یە رەنگە عائیقێکی گەورە بێت لەرێی یەکگرتنیان دا.

کەلەیاسای ژمارە (٢) دا هاتووە. ئەنجومەنەکە لەسەرەک وەزیرو سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتیمانی و سەرۆکی دادگای «تەمیز» پێک دێت و بڕیارەکانی بەکۆمەڵ ئەبێت.

ج) ئەبێ پەرلەمان ئەو ئیجرائاتە بەدەنگدان پەسەند بکات.

دوو: حکومەت

أ) تا سازدانی هەڵبژاردنی داهاتوو، حکومەتێکی ئیئتلافی، هەرێمی کوردستانی عیراق بەڕێوە ئەبات.

ب) ئەو حکومەتە بەرفراوان ئەکرێ، تا ئەو گروپانەش بگرێتەوە کە لەپەرلەماندا نین. وەک حزبە سیاسی یەکان و کەمینە نەتەوەیی یەکان و شەخسیەتە بێ لایەنەکان.

ج) بڕیاردان لەناو حکومەت و ناو وەزارەتەکاندا بێ دەست تێوەردانی حیزبە سیاسی یەکان ئەبێت.

د) دوای لێکۆڵینەوەیەکی گونجاو ڕێخستنەوەی حکومەت دەست پێ ئەکات و، پسپۆڕی و شارەزایی ڕەچاو ئەکرێ، لەپێناو پێکهاتنی یا هەڵوەشاندنەوەی هەندێ وەزارەت، ڕووبەڕووبوونەوەو خۆ ئامادەکردنی باشتر بۆ دابینکردنی پێویستی یەکانی هەرێم.

هـ) پێکهێنانی ئەم دامەزراوانە؛

مجلس خدمەی مەدەنی :-

بەرپرسیار ئەبێ لەدامەزراندنی کارمەندان، بەپێی بنەمای لێهاتوویی و پسپۆڕی نەک حزبایەتی.



دیوانی چاودێری دارایی :-

بەرپرسیار ئەبێ لەپیاچوونەوەی بەڕێوەبردنی دارایی هەرێم.

ئەنجومەنی پلان دانان :-

بەرپرسیار ئەبێ لەدانانی پلانی ئابووری هەرێم و، گەشەپێدانی بخاتە ڕیزی پێشەوە.

- پێویستە سپاردنی ژمارەی پۆستی وەزارەتە حەساسەکان بەپێی پرەنسیبی هاوسەنگی لەنێوان هەردوو حزبی سەرەکی دا لەپێهێنانی حکومەتی نوێدا ڕەچاو بکرێ.

- ئیدارەی ئێستای کوردستانی عیراق سەلماندی کە بێ توانایەو پێویستی بە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە هەیە بەگشتی و بەسەرپەرشتی ئەنجومەنی وەزیران. ئەبێ کارمەندان بەپێی تواناو شارەزایی دامەزرێن و، بەئینتیمای سیاسی نەبێ. کارمەندانیش پێویستیان بەموچەی باش هەیە، تا گەندەڵی ئیداری قەلاچۆ بکرێ و، ئیدارەیەکی بەتواناو شارەزا بێتە کایەوە.

سێ: دەستور

ئەبێ دەستوری بۆ هەرێمی کوردستان ئامادە بکرێ و، پەیمانگای (ئەنستیتوتی کورد) پسپۆڕانی دەوڵەتە فیدرالییەکان بانگ بکات و کۆیان بکاتەوە، بۆ ئەوەی پێش مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٤) پرۆژەی دەستور ئامادە بکەن. پاشان پرۆژەکە ئەخرێتە بەردەم ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان بۆ پەسەندکردنی، بەر لە کۆتایی هاتنی

سالْ.

<u>چوار: هەڵبژاردن</u>

أ) دوای تەواوبونی وادەی پەرلەمانی ئێستا، مانگی نایاری ساڵی (١٩٩٥) هەڵبژاردنی سەروکایەتی و پەرلەمان ئەنجام ئەدرێ.

ب) پێویستە پروسەی ئاسایی کردنەوەی بارودۆخ پێش هەڵبژاردن بێت.

ج) بە مەبەستی ئامادەکردنی لیستی ڕاست و دروستی دەنگدەران، ئەبێ سەرژمێری دانیشتوان بکرێ بەر لە هەڵبژاردن.

د) پێویستە ژمارەیەکی زۆری چاودێرانی بیانی سەرپەرشتی و چاودێری هەڵبژاردن بکەن.

هـ) پێویستە سەرکردەی حزبەکان، لە بەردەم ڕای گشتی ناوخۆ و جیهان بەڵێن بدەن ئەنجامی هەڵبژاردنەکە هەرچۆنێک بوو، قبوڵی بکەن.

ز) ئەنجامی هەڵبژاردنەکە هەرچۆنێک بێت، حکومەتێکی ئیئتلافی پێک دێت، لە بەر ڕۆشنایی تەرازوی نوێی هێزەکان، واتە بەپێی ڕێژەی نوێنەرایەتی هەر حزبێک لەناو ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستاندا.

ح) هەڵبژاردنی شارەوانی بەپێی یاسایی ئەنجام بدرێت، کاتی ئەم هەڵبژاردنەش بەپێی ڕێکەوتنی هەردوو حزب دەستنیشان ئەکرێ.



دووەم

## سوپاو ئاسایشی هەرێم

<u>یەک:</u>

أ) سیستەمی بەرگری نیشتیمانی ئێستا ئاشکرای کرد کە بێ توانایە و پێویستە بەشێوەیەکی بەرفراوانتر، سەرلەنوێ ڕێک بخرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە هەیئەتێکی ئەرکان حەرب وەزارەتی پێشمەرگە بگرێتەوە، ئەم هەیئەتەش لە گەورە ئەفسەران پێک دێت و، ڕاستەوخۆ ئەخرێتە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێری سەرەک وەزیرو جێگری سەرەک وەزیر.

ب) پێویستە سوپایەکی یەکگرتوو بە تەواوی لە خزمەتی حکومەتدا بێت و، بەرپرسیاری بەرگری و پارێزگاری هەرێمی کوردستانی عێراق بێت، خزمەت کردنی سەربازیش ئیلزامی بێت.

ج) لەم قۆناغەدا، پێویستە ژمارەی هێزی پێشمەرگە زۆر کەم بکرێتەوە، بگاتە ئەو ڕادەیەی کە هەردوولا بەهاوبەشی لەسەری ڕێک بکەون.

د) هەڵوەشاندنەوەی میلیشیاکان، بەپێی جەدوەلێکی زەمەنی، کە هەردوولا بەهاوبەشی لەسەری ڕێک بکەون، پێویستە پێشنیار بکرێ بۆ ئەوەی چەکدارانی میلیشیاکان ڕووبەڕووی حەدەماتی (ضمان)ی احتماعی بکرێنەوە.

هـ) بۆ ئەوەی خاڵەکانی ئەم ڕێکەوتن نامەیە بەعەمەلی جێبەجێ بکرێ، پێویستە کەڵک لە ئەزمون و شارەزایی بیانی وەربگیرێ.

دوو: هێزی پۆلیس و ئاسایش

ا) سەرلەنوێ و بەپەلە هێزی پۆلیس و ئاسایش ڕێک بخرێتەوەو، بەتەواوی بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتەوە، چونکە ئەهمیەتی زۆرەو، سەلامەتی خەڵک و مومتەلەکاتی هەرێم دابین دەکات.

ب) پێویستە پروسەی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە بە سەرپەرشتی و لێپرسراوێتی ئەنجومەنی وەزیران بێت. ئەوەش پێویستی بە توانای تەکنیکی و دارایی هەیە. پێویستە هێزی پۆلیس و ئاسایش مەشق و موجەی تەواویان هەبێ تا بتوانن ئیلتیزام بە ئەرکەکانیانەوە بکەن بە تەواوی ڕێکوپێکی.

ج) کولیەی شرطە بکرێتەوە بۆ مەشق پێکردنی پۆلیس و ئاسایش.

د) هێزی پۆلیس و ئاسایش مەشقی تایبەتی یان پێ بکرێ لەسەر پرنسیپەکانی هەڵسوکەوتی مەدەنی و، دیموکراتی و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و، دڵسۆزیان بۆ حکومەت.

هـ) پسپۆرانی بیانی بانگ بکرێن، بۆ یارمەتی دانی هێزی چەکدار، بەتایبەتی لە بواری تەکنیکی و مەشق دا.

ز) بەپەلە جەدوەلێکی زەمەنی دابنرێت بۆ دیاریکردنی رادەو قۆناغەکانی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەو، کونفرانسێ بۆ هێزی پۆلیس و ئاسایش ببەسترێ، بەر لە کۆتایی مانگی ئاب، تا جەدوەلی زەمەنی و



شێوازەکانی ئاڵوگۆڕ دەستنیشان بکرێ.

ح) ئەو دەزگاو دامەزراوە کارمەندانەی کە سەر بە حزبەکانن لە ناو پۆلیس و ئاسایش دا پێویستە بگوێزرێنەوە بۆ دەزگا خزمەتگوزاری یەکانی تری حکومەت و، وەرگرتنی پۆلیس و ئاسایش ئەبێ بەشێوەی ئەحیدبێت و، دەرچووی زانکۆکان و پسپۆران دوای مەشق لە دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش وەربگیرێن.

سێیەم

## ئابوری و دارایی

ا) بەهۆی باری خراپی ئابوری لەکوردستانی عیراق، کەبەدەست گەمارۆی دووجەمسەرەوە، ئاسەواری جەنگە یەک بەدوای یەکەکانەوە ئەنالێنێ و، زیاتر (٥٠٪)ی خەڵک بێکارن و ئەم بارودۆخە یەکێک بوو لەهۆیەکانی ئاکۆکی یەکانی ئەم دوایی یە...، دوای سەقامگیربوونی هێمنی لەهەرێم دا، پێویستە پارمەتی نێودەوڵەتی گەورە دابین بکرێت.

ب) سرک کردنی ئابلوقەی نەتەوە یەکگرتووەکان، فاکتەری هێمنی یە، تا بتوانرێ ئامێرو دەزگای پێویست دابین بکرێ بۆ ژیانەوە و بوژانەوەی ئابوری، بەتایبەتی دابین کردنی پێداویستی یە سەرەکی یەکانی دانیشتوان لەبواری وزەدا.

ج) لەبەر ئەوەی دابەش کردنی پارمەتی یە نێودەوڵەتی یەکان لەرێی رێکخراوە ناحکومی یەکانەوەیە، حکومەت هیچ بەرنامەیەکی نیە بۆ رێکخستن و پلانی ئابوری، پێویستە حکومەتی هەرێم راستەوخۆ داوا لەو ولاّتانە بکا، لەو ئاژانسە فریاگوزاری یان بکات، راستەوخۆ یارمەتی حکومەت بدەن بۆ ژیاندنەوەی ئابوری هەرێم.

د) ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان بەزووترین کات یاسایەک دابرێژێ



بۆ دیاریکردنی سنوورو کاری رێکخراوە ناحکومی یە ناوخۆیی و بیانی یەکان.

ھ) پێویستە داهاتی گومرکەکان بچێتە ناو خەزینەی گشتی یەوەو، ئەبێ حزبەکان حساباتی هەموو ئەو داهاتانە تەسلیم بەحکومەت بکەن، کە لەسەرەتای مانگی ئایار (١٩٩٤)ەوە دەستیان کەوتووە. پێویستە حکومەت بەهیچ جۆرێ یارمەتی حزبەکان نەدات تاگومرکەکان بەتەواوی کۆنترۆڵ نەکات.

ز) بەشی بەرێوەبەرایەتی گومرک، سەرلەنوێ رێک بخرێتەوەو، پاکرێتەوە لەهەموو کەسە بێ تواناکان و، کارمەندی پسپۆر بخرێتە جێ یان، شارەزایی و لێهاتویی رەچاو بکرێ و ئینتیمای سیاسی یان نەکرێتە پێوانە.

ح) پێویستە بانکی هەرێم، لەلایەن هێزی پۆلیسی حکومەت بپارێزرێ و پاسەوانی بکات، حزبەکان کاریان نەبێت بەسەری یەوە.

## چوارەم

## پەیوەندی ناوچەیی و دەرەوە

یەک :

پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ

ا) ئیدارەی کوردستان، مافی پەنابەرێتی ئەدات بەهەموو کوردێکی زوڵم لێکراو، بەمەرجێ بنکەی سەربازی لەناو کوردستانی عیراق دا دانەنێت و، لەسنورەوە هێرشی چەکداری نەکەنە سەر دەوڵەتی مەرکەزی.

ب) لەکاتێکدا بڕوامان بە پرەنسیپی دەست تێوەرنەدان لەکاروباری ناوخۆی کوردستانی عیراق و کاروباری ناوخۆی وڵاتانی دراوسێ هەیە، هەردوولا پێشوازی ئەکەن لەرێگەچارەی ئاشتیانە و دیموکراسییانەی کێشەی کورد لەو وڵاتانەدا.

ج) هەر هاریکاریەک لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و حزبە سیاسییەکان ئەبێ بۆ بەرژەوەندی یەک لایەن بەکارنەیەت، بەڵکو ئەبێ بۆ بەرژەوەندی گەلی کوردبێت لەکوردستانی عیراق، بۆ ئەم مەبەستە هەردوولا ئاگاداری یەکتر ئەکەن و هاریکاری یەکتر ئەکەن و خۆ ئەپارێزن لە هەر دەستپێشکەرییەکی یەک لایەنە کە لەسەر حیسابی کوردی وڵاتانی دراوسێ بێت.



دوو :

نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەدەرەوە.

ا) نوێنەری حکومەتی هەرێم، نوێنەری رەسمی حکومەتە، پێویستە هاریکاری حێگرەکەی بکات لەبواری پەیوەندییەکانی دەرەوەدا.

ب) نوسینگە حزبییەکان، نابێ دەست لەکاروباری نوێنەرەکانی دەرەوەی حکومەتی هەرێم وەردەن.

ج) دامەزراندنی نوسینگەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەدەرەوە، کۆمەک کردنیان لەلایەن حکومەتەوە، هەردوو حزب لە قۆناغی یەکەمدا پێداریستییەکانی ئەو نوسینگانە دابین ئەکەین.

د) نوێنەرانی حکومەتی هەرێم لەدەرەوە، بەرێک وپێکی دەوری یەکتر ئەبینن و، چاریان ئەکەوێ بەسەرکردایەتی هەردوو حزب.

هـ) سازکردنی سیمینارو کۆنفرانسەوە بۆ نوێنەرانەوە رەخساندنی بەشداریکردنیان لەمەشق و دەورەی دیپلۆماتی دا.

ز) پێکهێنانی کۆمیتەیەکی باڵا لە پسپۆران و شارەزایانی سیاسەتی دەرەوە، تا حکومەتی هەرێم لەمەسەلەی سیاسەتی دەرەوە رارێژی پێ بکات.

ح) دامەزراندنی نوسینگەی حکومەتی هەرێم لەنیویۆرک و بروکسل.

## پێنجەم

## جەدوەلی زەمەنی

ا) ئاسایی کردنەوەی دەسبەجێ.

ب) ئەبێ بەرلە کۆتایی مانگی ئابی ١٩٩٤ حکومەتێکی نوێ و ئەنجومەنێکی سەرۆکایەتی پێک بێت.

ج) ئەبێ مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩٤ سەرژمێری دانیشتوان بکرێ و لیستی دەنگدەران بەر لە کۆتایی مانگی کانونی دووەم تەواو بێ.

د) ئەو پسپۆڕو شەخسیەتانەی کە بەڕێز کوشنەر بەڵێنی داوە بیان نێرێ بۆ کوردستان، ئەبێ بەر لە سەرژمێرکردن بگەنە کوردستان.

ه) ئەبێ پسپۆڕان و چاودێرانی هەڵبژاردن، پێش هەڵبژاردن بگەنە کوردستان، گەر بکرێ سەرەتای ساڵی (١٩٩٥) بگەن.

ز) ئەبێ پرۆژەی دەستوری هەرێم بەیارمەتی پسپۆڕان لەتشرینی یەکەم ئامادە بکرێت و پێشکەش بە (ئە.ن.ک) ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان بکرێ بۆ پەسەندکردنی پێش کۆتایی ساڵی ١٩٩٤.

ح) پێویستە حکومەتی نوێ پێش کۆتایی ساڵی (١٩٩٤)، دامەزراوە نوێیەکان وەک ئەنجومەنی خزمەتگوزاری مەدەنی و دیوانی چاودێری دارایی و ئەنجومەنی پلان دانان پێک بێنێ.



## شەشەم

## چاودێری و حەکەمی

دەقی ڕێکەوتننامەکە بەهەردوو زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی لە ٢٢ی تەموزی ١٩٩٤ ئیمزاکرا. بەئامادەبوونی بەڕێزان بیرنارد دووران ڕاوێژکاری دەوڵەت و باڵیوزی فەرەنسا، کەنداڵ نەزان سەرۆکی ئەنیستیتوی کورد لەپاریس، د. نجم الدين کەریم سەرۆکی کۆنگرێسی نیشتمانی کورد KNC، ئەم بەڵگەنامانە بارە پێکراون.

کۆمیتەی چاودێری لەشەخسیەتی کوردی و بیانی و ڕاوێژکاران پێک دێت، بۆ حەکەمی و بەکلایی کردنەوەی، بیروڕا جیاوازەکان سەبارەت بە ڕوونکردنەوەو جێبەجێ کردنی بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە.

ـ پێکهاتنی ئەم کۆمیتەیە.

پێش ئیمزاکردنی لەلایەن هەردوو سەرکردەی کوردو دوای پرس و ڕا لەگەڵ چەند حزبێکی دیاریکراودا دەستنیشان ئەکرێ.

| سەرۆکی وەفدی پ.د.ک | سەرۆکی وەفدی ی.ن.ک |
| --- | --- |
| سامی عبدالرحمن | نەوشیروان مستەفا |